بەڵێ، دڵ و دەروونی ئینسان، بێجگە لە یادی خوا، بە هیچ شتێکی دیکە تینوایەتیی ناشکێ و ئارام و ئاسوودە نابێ و، ئینسان جگە لە خواپەرستیی و بەندایەتیی کردن بۆ خوا، هیچ شتێکی دیکە تەسەللای نادات و ئۆخژنی بۆ ناهێنێ، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە ئینسان وادروست کراوە: لە ناخی فیترەت و کەسایەتییەوە، خواو خاوەنی خۆی دەناسێ و پێی ئاشنایە، ئنجا لە کاتێکدا هەست بکات بە هۆی بەندایەتیی و فەرمانبەریی و پەرستنییەوە، خوا لەگەڵی دۆستەو لێی ڕازییەو پەیوەندییەکی ڕاست و دروستی لەگەڵ ئەو تاقە پەروەردگارو پەرستراوەی خۆیدا هەیە، ئەوە لە بێزاریی و ڕاڕایی و هەڵپەهەڵپ، قوتاری دەبێ و، دەبێتە خاوەنی دڵێکی ئارام و دەروونێکی ئاسوودەو کەسایەتییەکی سەقامگیرو دامەزراو و نەلەخشاو، وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی:

[يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾] (الفجر ٢٧-٣٠).

واتە: ئەی نەفسی ئارامگرتوو! بگەڕێوە لای پەروەردگارت، تۆش لەو ڕازی و ئەویش لە تۆ ڕازییەو، بچۆ نێو بەندە - چاکەکارو وەفادارە-کانم و، بچۆ نێو بەهەشتەکەمەوە.

هەروەها فەرموویەتی: [أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ] (يونس ٦٢-٦٤).

واتە: ئاگادار بن! بێگومان دۆستەکانی خوا، نە ترسیان لەسەرە {بۆ داهاتوو} و نە خەمبار دەبن {بۆ ڕابردوو} {دۆستانی خواش}

ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوەو پارێزکارییشیان دەکرد. ئەو {بەندە ڕەسەن و وەفادار}انە لە ژیانی دنیاو لە دوارِۆژدا، موژدەیان پێ دەدرێ- {بەوە کە لەسەر ڕێی ڕاست و دروستن و خوا لێیان ڕازییە}-.

پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی نوێژ، کە بەرزترین و مەزنترین جۆرو شێوەکانی بەندایەتیی و خواپەرستییەو، ئەوپەڕی ملکەچیی و زەلیلیی بۆ خوا تێدایە، فەرموویەتی: {..وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِيَ فِي الصَّلاَةِ} (أخرجه أحمد برقم: ١٢٣١٥، والنسائي برقم: ٣٩٣٩، وأبو يعلى برقم: ٣٥٣٠، والحاكم برقم: ٢٦٧٦، وقال: صحيح على شرط مسلم، والبيهقي برقم: ١٣٢٣٢).

واتە: ... ڕۆشنایی چاو و فێنکی هەناوم لە نوێژدایە!



هەروەها کاتێك کە وەختی بانگ و نوێژ دەهات، فەرمانی بە (بلال)ی حەبەشەیی (خوا لێی ڕازی بێ) دەکردو دەیفەرموو: {أَرِحْنَا بِهَا يَا بِلاَل} (أخرجه الطبراني في الكبير برقم: ٦٢١٥).

واتە: ئەی بیلال! [ بانگەکەت بڵێ و] بەهۆی نوێژەوە ئاسوودەمان بکەو بمانحەسێنەوە! ئنجا ئاشکرایە کە لە نێوان (بە نوێژ ئاسوودە بوون و حەسانەوە) کە عادەتی پێغەمبەری خواو مسوڵمانە شوێنکەوتووەکانیەتی و، (لە نوێژ قوتار بوون و حەسانەوە)ش، کە عادەتی مسوڵمانانی کرچ و کاڵە، جیاوازیی هێندەی ئاسمان و ڕێسمان هەیە! ئێستاش با سەرنجی قسەو بیروڕای هەندێك لە زانایانی هۆشیارو دڵ بێدارمان بدەین، داخۆ لەوبارەوە چی دەڵێـن:

(إبن تیمیة) -خوا لێی خۆش بێ- لەوبارەوە نووسیویەتی: ((دڵ (القلب) لە دوو لاوە پێویستیی بە خوایە، لە لایەنی بەندایەتیی و

پەرستنەوەو، لە لایەنی یارمەتیی لێ وەر گرتن و پشت پێ بەستنەوە، چونکە (دڵ ) بەس بە پەرستن و خۆشویستن و ڕووکردنە پەروەرد گاری، چاك و سەرفرازو بەختەوەر دەبێ و، هەست بە تام و چێژو خۆشیی دەکات و، ئۆخژنی بۆ دێ و دادەمرکێ و، بە پێچەوانەوە: ئەگەر هەرچی شتی هەیە، وەدەستی بێنێ، بەبێ خوا ناگاتە پلەی ئارامیی و ئۆخژن بوون، چونکە ئاتاج بوونی ئینسان بە خوا، شتێکی بنەڕەتیی و سروشتییە لە سۆنگەی ئەوەوە کە تەنیا خوا پەرستراوو خۆشەویست و مەبەستیەتی... ئنجا ئەوەش بۆ ئینسان مەیسەر نابێ مەگەر خوا یارمەتیی بدات، ئنجا بۆیە ئینسان هەمیشە پێویستیی بەو ڕاستییەیە کە لە (إياك نعبد وإياك نستعين)دا، شێرراوەتەوە))[1].



(إبن قيم الجوزية)ش -خوا لێی خۆش بێ- لەوبارەوە گوتوویەتی:

(بێگومان هیچ شتێك لەلای دڵان (قلوب) لە بەدیهێنەرو پەروەرد گاریان خۆشەویستتر نیە، چونکە هەر ئەو خواو پەرستراویانەو، دۆست و پشتیوانیانەو، پەروەرد گارو مشوور گێڕیانەو، ڕۆزیی دەرو، مرێنەرو ژیێنەریانە، بۆیە خۆشویستنی وی، نازو نیعمەتی هەناوان و، زیندەگیی گیانان و دەروونان و، بژێوی دڵان و، ڕووناکیی بیرو هۆشان و، ڕۆشنایی چاوان و، ئاوەدانیی نێوەوەی ئینسانە!

ئنجا لە لای دڵ ساغەکان و، ڕووح پاکەکان و، عەقڵ تەواوەکان، هیچ شتێك شیرینترو بەتامترو خۆشترو دڵخۆشکەرترو چاکتر نیە، لە خۆشەویستنیی و هۆگربوونیی و شەیدا بوونیی و، ئەو شیرینایەتییەی

---

(١)) بڕوانە کتێبی (العبودية) ص ١٠٨-١٠٩، و (العبادة في الإسلام) د. يوسف القرضاوي ص٩٨.

که ئیماندار لەوبارەوە، لە دڵ و دەروونی خۆیدا، هەستی پێ دەکات، لە سەرووی هەموو جۆرە شیرینایەتییەکی دیکەوەیەو، ئەو نازو نیعمەتەی کە لەو ڕێیەوە وەدەستی دێنێ، لە هەموو نیعمەتێك تەواو ترەو، ئەو خۆشییەی کە بەو هۆیەوە پێی دەبڕێ، لە هەموو خۆشییەك بەرزترە، وەك یەکێك لەو خاوەن دڵانە، دەربارەی حاڵ و باڵی خۆی گوتوویەتی: ( هەندێك حاڵم بەسەر دڵدا دێن، لەبارەیانەوە دەڵێم: ئەگەر خەڵکی بەهەشتیش هەموویان لەم جۆرە حاڵانەدا بن، بێگومان لە ژیانێکی خۆش دان)!! ... هەروەها یەکی دیکە لەو جۆرە کەسانە گوتوویەتی: (لەخوا بێخەبەران بەستەزمانن! لە دنیا دەردەچن بێ ئەوەی لە خۆشترین شتی بتامێنن) پێی گوترا: ئەو شتە چی بوو؟! گوتی: خۆشویستنی خوا و هۆگربوونیەتی، یەکی دیکەیان گوتوویەتی: (خۆشترین شتی دنیا، ناسین و خۆشویستنیەتی و، خۆشترین شتی دوارِۆژیش، دیتنیەتی و بیستنی فەرموودەیەتی بەبێ پەردەو هۆ)!



یەکی دیکە لە خواناس و خواپەرستان گوتوویەتی: (لو علم الملوك وأبناء الملوك ما نحن فيه، لجالدونا عليه بالسيوف) واتە: ئەگەر پادشاو پادشازادەکان، بەو حاڵەی ئێمەیان زانیبایە کە تێیداین، بۆ ئەستاندنی ئەو حاڵە شەرە شیریان لەگەڵ دەکردین)[1].

---

(١) بڕوانە: (إغاثة اللهفان) ج (٢)، ص(١٩٧)، لابن قيم الجوزية، و (العبادة في الإسلام)، ص(٩٨، ٩٩).

## بڕگەی دووەم

## خواپەرستیی تاقە ڕێی ئازادیی ڕاستەقینەو پچڕاندنی کۆت و زنجیری دیلیی و کۆیلایەتییە

بەڵێ خوێنەرانی بەڕێز!

خواپەرستیی (عبادة)ی ڕاست و ساغ، تاقە ڕێیەکە کە ئینسان بتوانێ ئازادیی ڕاستەقینەی پێ وەدەست بهێنێ و، کۆت و زنجیری هەموو جۆرە دیلیی و کۆیلایەتییەکی پێ لە دەست و گەردنی خۆی بپسێنێ و، نیری هەر تاغووت و ستەمکارێکی پێ لەسەر شانی خۆی لابدات و، خۆی لە خەم و پەژارەی دنیاو قیامەتان بڕەخسێنێ.

چونکە ئینسان لە سۆنگەی ئەوەوە کە لە زاتی خۆیدا، حەوجێ و پەککەوتەیەو ئەگەر بە هۆی خۆ لێ گۆڕان و لە خۆبایی بوونەوە، پەردەی ڕەشی بەسەر دڵ و مێشکان هەڵنەکشابێ، زۆر بە ڕوونیی و لە قووڵایی دڵ و ناخی دەروونییەوە، هەست بەو بێهێزیی و کلۆڵیی و ئاتاجییەی دەکات و، دەزانێ کە حەتمەن دەبێ پشتیوانێکی هەبێ، پشتی بگرێ و، پەنایەکی هەبێ سەری پێ بێنێ و، لە چاڵی ئاتاجیی و بێدەرەتانیی و بێ پەنایی، دەری بێنێ و دەستی بگرێ و، بەرەو سێبەری دڵ ئارامیی و ئۆخژن و دڵنیایی بیهێنێ.

ئنجا ئاشکرایە - بۆ هەموو خاوەن عەقڵ و ویژدانێکی ساغ- کە جگە لە خوای پەروەردگارو بێوێنە، هیچ کەس و هیچ شتێك، لەوە ناوەشێتەوە، کە مرۆڤ بیپەرستێ و پشتی پێ ببەستێ و، ئەگەر گریمان هەندێك کەس بە هەڵە غەیری خوایان کردە پەرستراو و پشت و پەنای خۆیان، ئەوە لە ئەنجامی بزرکردنی پەرستراوی ڕاستەقینەدا:

سەرەڕای ئەوەی كە بە مەرەدی ئەو كەسە دەچن، كە تراویلكە (سراب) ی بە ئاو حیساب كردوەو، دوایی نەزانیی و بەهەڵە داچوونی خۆی بۆ دەركەوتوە، گیرۆدەی چەندان دەردو نەخۆشیی سامناكیش دەبن، كە پیسترینیان دڵ بڵاوبوون و كەسایەتیی لەت بوون (إنفصام الشخصية)ە، وەك خوای زاناو شارەزا بە نهێنییەكان فەرموویەتی:

[ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَـٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ] (الزمر-٢٩).

واتە: خوا وێنەی هێناوەتەوە [ بۆ جیاوازیی نێوان خوا بەیەكگرتن و هاوبەش بۆ خوا پەیداكردن ] بە پیاوێك[ی كۆیلە] كە چەند 
شەریكێكی پێكەوە ناكۆك تێیدا بەشدارن [و دەبێ خزمەتی هەموویان بكات!] هەروەها بە پیاوێك [ ی كۆیلە]ی دیكە، كە بۆ [خزمەتی] ٩٧
پیاوێك یەكلا بۆتەوە، ئایا حاڵیان وەك یەكە؟: سوپاس بۆ خوا 
[لەسەر دەركەوتنی هەق، كە خوا بەیەكگرتنەو پووچانەوەی (باطل) كە هاوبەش بۆ خوا دانانە] بەڵام زۆربەیان نازانن [و نافامن كە شیرك چەندە حاڵێكی نارەحەت و گرانە].

بەڵێ مرۆڤ وا دروستكراوەو هەڵخراوە، كە نەتوانێ بەبێ خواو پەرستراو بێت، ئنجا ئەگەر خواو پەرستراوی ڕاستەقینەی پەرست، ئەوە بەمراد گەیشتوەو لە خەم ڕەخسیوە، ئەگەر نا، وەنەبێ بە هۆی پشت لە خوا كردنەوە، لە پەرستن و، بەندایەتیی ڕزگار بووبێ، بەڵكو حەتمەن دەبێ شتێك هەر بپەرستێ لە جیاتی خوا، ئنجا ئەو شتە هەرچی هەیە با ببێ: شەیتان، تاغووت، خۆرو مانگ و ئەستێرە، فریشتە، شێخ و پیاوچاك، دارو بەرد، هەواو ئارەزوو پارەو سامان... هتد، بەڵام بێگومان ئینسان بە پەرستنی غەیری خوا، نەك هەر

هەست بە ئارامیی و دڵنیایی و ئاسوودەیی ناکات، بەڵکو دووچاری حاڵەتێکی یەکجار سەخت و دژوار دەبێ، کە تێیدا دەبێتە نێچیری چەندان دەردو نەخۆشیی کوشندەو بێرەزا!

ئایا ئەو کەسەی تینوایەتیی تینی بۆ دێنێ و، شپرزەی دەکات و، لە جیاتی ئاوی شیرین، ئاوی تاڵ و سوێری دەریا دەخواتەوە، لەجیاتی تینوایەتیی شکان و، تەسەللا هاتن و، فێنکایەتیی لە دڵ گەڕان، بە پێچەوانەوە: پتر لە تینووان شپرزە نابێ و، دڵ و هەناوی، سەرتاپای جەستەی، بە ئاگری تینوێتیی هەڵناقرچێ؟!

خوای دادگەرو بەخشەر لەوبارەوە کە بە هۆی ئیمان و پارێزکاریی و بەندایەتیی کردن بۆ خوای بەدیهێنەرو، شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری پێشەواو سەرودەر (صلی الله علیه وسلم) ئینسان دەبێتە ئەهلی کردەوەی چاك و ڕۆزی پاك و، بەشمشێری خوا بە یەككگرتن (التوحید) سەری تاغووت دەپەڕێنێ و، کۆت و زنجیری کۆیلایەتیی و دیلیی لە دەست و پێ و گەردنی خۆی دەپسێنێ و، ئازادیی و سەرفرازیی ڕاستەقینەی دنیاو دوارۆژ وەدەست دێنێ، فەرموویەتی:

[...وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾] (الأعراف -١٥٦، ١٥٧).

واتــە: {خوا فەرمووی:} بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام بەس بۆ ئەوانەی تۆمار دەکەم، کە پارێزکاریی دەکەن و خۆیان تەزکیە دەکەن و[1]، ئەوانەی کە بڕوا بە ئایەتەکانمان دێنن. ئەوانە کە شوێن ڕەوانەکراوی پێغەمبەری نەخوێندەوار دەکەون، کە لە تەوڕات و ئینجیلی لای خۆیاندا دەیبینن {ناووشۆرەتی} نووسراوە، فەرمانیان پێ دەکات بە هەرچی چاکەیەو، هەرچی خراپەیە لێیان قەدەغەیان دەکات و، هەرچی ڕۆزیی و شتی پاك و چاکە، بۆیان حەڵاڵ دەکات و، هەرچی پیسیی و زیان بەخشە لێیان حەڕام دەکات و، ئەو قورساییەی[2] کە لەسەر شانیان بووەو، ئەو کۆت و زنجیرانەی کە پێیانەوە گرفتار بوون، لێیان لادەبات، ئنجا ئەوانەی بڕوایان پێ هێناوەو، ڕێزو حورمەتیان گرتوەو، پشتیوانییان کردوەو، شوێن ئەو ڕووناکییە کەوتوون، کە لەگەڵی نێرراوەتە خوارێ، ئا ئەوانەن سەرکەوتووان و بە مراد گەیشتووان[3].



---

(١) دیارە بە کردەوە خۆ تەزکیەکردن شتێکی فەرزەو، خەسڵەتێکی زۆر بەرزو پەسەندە، بەڵام بە پێچەوانەوە: بە قسەو زمان تەزکیەی خۆکردن، حەرامەو شتێکی نزم و پەستە.

(٢) وشەی (إصر) لە ئەصلی زماندا، بە مانای: بەڵێن و پەیمانی پتەوو، بە مانای: گرێ دان و بەستنەوەی شت دێ، لێرەشدا مەبەست ئەو شتانەن کە لە جوولەکەکان لێیان حەڕام، یان لەسەریان پێویست کرابوون، لەبەر سەرەخەریی و بەدفەڕیی خۆیان، کە بۆیان وەك کۆڵێکی قورس وابوو،. بڕوانە (تفسیر مفردات ألفاظ القرآن الكريم)، ص (٧٨)، سميح عاطف الزين.

(٣) (راغب الأصفهاني) دەربارەی چەمك و واتای (فلاح) گوتوویەتی: (الفلح: الشق، وقيل الحديد بالحديد يُفَلَّحُ أي يشق، والفلاَّح: الأكّار لذلك، والفلاح: الظفر وإدراك البغية، وذلك ضربان دنيوي وأخروي، فالدنيوي: الظفر بالسعادات التي تطيب بها الحياة الدنيا، وهو البقاء والغنى والعز... وفلاح أخروي وذلك أربعة أشياء: بقاء بلا فناء، وغنى

بەڵێ بەندایەتیی کردن بۆ خوا، ڕزگاریی و سەرفرازیی دنیاو دوارۆژ بۆ مرۆڤ مسۆگەر دەکات و، هەموو جۆرە تۆق و کۆت و زنجیرەکانی دڵ و مێشك و گەردن و دەست و پێیان دەپسێنێ و، لە زیندانی دیلیی و کۆیلایەتیی دروست کراوەکان، دەری دێنێ، پێغەمبەری پێشەواشمان (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {مَنْ جَعَلَ الْهُمُومَ هَمًّا وَاحِدًا هَمَّ آخِرَتِهِ، كَفَاهُ اللَّهُ هَمَّ دُنْيَاهُ، وَمَنْ تَشَعَّبَتْ بِهِ الْهُمُومُ فِي أَحْوَالِ الدُّنْيَا لَمْ يُبَالِ اللَّهُ فِي أَيِّ أَوْدِيَتِهَا هَلَكَ } (أخرجه ابن ماجه برقم: ٢٥٧، وابن أبي شيبة برقم: ٣٤٣١٣،، والبزار برقم: ١٦٣٨).

واتە: هەرکەسێك مەبەست و خەمەکانی بکاتە یەك، کە مەبەست و خەمی دوارۆژە - واتە گەیشتن بە ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی بەرین- خوا خەمی دنیای لە کۆڵ دەخات و، کاروباری ژیانی بۆ سێنا دەکات، بەڵام هەر کەسێك خەم و خولیایەکانی بە شیوو دۆڵەکانی حاڵ و باڵی دنیادا، لێ پرژو بڵاو بن، ئەوە خوا بایەخیی پێنادات، داخۆ لە چ دۆڵ و شیوێکدا دەفەوتێ.

---

بلا فقر، وعلو بلا ذل، وعلم بلا جهل...) بڕوانە: (معجم مفردات ألفاظ القرآن)، ص(٣٩٩)، واتە: (فلح: دڕین و لەت کردنەو، گوتراوە: ئاسن بە ئاسن شەق دەکرێ (فلاّح - جووتیار)یش ئەو کەسەیە کە ئەو کارە ئەنجام دەدات، (فلاح)یش سەرکەوتن و بە مراد گەیشتنە، ئەویش دوو جۆرە: دنیایی و دوارۆژیی، دنیاییەکە بریتیە لە دەستگیرکردنی ئەو بەختەوەرییانەی کە ژیانی دنیایان پێ خۆش دەبێ، کە بریتین لە: مانەوەو دەوڵەمەندیی و دەسەڵات، سەرفرازیی دوارۆژیش بە چوار شتان دەبێ:
١- مانەوەی بە بێ لە بەین چوون.
٢- دەوڵەمەندیی و بێنیازیی بە بێ هەژاریی و نەداریی.
٣- دەسەڵاتێك کە ژێر دەستەیی و زەبوونیی ڕەگەڵ نەکەوێ و بەدوای دا نەیەت.
٤- زانیارییەك کە نەزانیی و نەفامیی تێکەڵ نەبێ.

## بڕگەی سـێیەم

## خواپەرستیی دەروونی مرۆڤ دەشوات و چڵک و چەپەری گوناح و خراپە لادەبات

یەکی دیکە لە بەرهەم و شوێنەوارە گرنگ و مەزنەکانی خوا پەرستیی لە ژیانی ئینساندا - واتە ئینسانی خواپەرست- بریتیە لە شۆران و خاوێن بوونەوەی دڵ و دەروونی و، لاچوونی ئەو ژەنگ و ژارو چڵك و چەپەرەی، کە لە ئەنجامی خوتخوتەی شەیطان و تاوان و سەرپێچییەکانییەوە، لەسەری پەیدا دەبێت و، جاری وایە ڕەش دادەگیرێ و، بگرە کەمرەشی لەسەر دەبەستێ!

خوای پەروەردگار دەربارەی چۆنیەتی ژەنگ هێنانی دڵ و دەروونی ئینسان و ڕەش داگەڕانی، بە هۆی گوناح و تاوان و خراپەوە، فەرموویەتی:

﴿وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٦﴾﴾ (المطففين ١٠-١٦).

واتە: سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بە درۆزانان، ئەوانەی ڕۆژی سزاو پاداشت بە درۆ دەزانن، جگە لە هەر لادەرێکی گوناحباریش، کەس بە درۆی نازانێ - ئەو لادەرە گوناحبارەی- کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە، دەڵێ: ئەفسانەکانی پێشینانن! نەخێر بەڵکو ئەو - کردەوە خراپان-ەی دەیانکەن، دڵیان داپۆشیون، نەخێر - ڕاست ناکەن - بێگومان ئەوانە ڕۆژی دوایی لە دیداری پەروەردگاریان پەنهان و پەردە پۆش دەکرێن، پاشان ئەوانە دەچنە نێو کڵپەی دۆزەخەوە.

وەك دەبینین: گوناحبارییی و خراپەكارییی، دەبێتە هۆی ڕەشداگەڕان و ژەنگ هەڵێنانی دڵ و دەروون و، لە ئەنجامی ئەو ژەنگ و ژارو كەمرە بەستن و گوناح و تاوان كەڵەكە بوونەشدا، ئەوانە شایستەیی ئەوە لە دەست دەدەن، كە لە ڕۆژی دواییی دا بچنە بەهەشت و، بە دیداری بەرزی خوای پەروەردگاریان شاد ببن و، سەرەنجام گیرۆدەی دۆزەخی بێئامان دەبن و، لەگەڵ مەرگ دا دەستەودامان دەبن؟

بەڵێ جگە لە پاكان و چاكان، هیچ كەس لەوە ناوەشێتەوە كە بچێتە بەهەشتەكانی خوای دادگەرو بەخشەرەوە، چونكە خوا كاربەجێیەو، هەركەس لە جێگاو ڕێگاو شوێنی شیاوی خۆیدا دادەنێ، وەك خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی:

[ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ] (الزمر -٧٣).



واتە: ئەوانەی پارێزكارییان لە بەرامبەر پەروەردگاریان دەكرد، كۆمەڵ كۆمەڵ، بەرەو بەهەشتێ بەڕێ كران، هەتا كاتێك هاتنە لای -بەهەشتێ- دەرگاكانی كرانەوە، دەرگاوانەكانی - بەهەشتێ- پێیان گوتن: سەلامتان لێ بێ پاك و چاكن، مادام وایە بچنە نێویەوە بە هەمیشەیی - تێدا نیشتەجێ بن-.

كەواتە: جگە لەوانەی پاك و چاكن، هیچ كەس شایستەی چوونە بەهەشت نیەو، تەنیا ڕێگای چاك بوون و چاكبوونەوەش، خواپەرستیی و چاكەكارییە، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:

[ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ] (هود -١١٤).

واتە: لەملاو لای ڕۆژگارو چەند بەشێك لە شەوگاردا، نوێژی بەرپا بکە، بێگومان -کردەوە- باشەکان خراپەکان لادەبەن، ئەوە پەندو ئامۆژگارییە بۆ پەند وەرگران.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە: {اتَّقِ الله حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ} (أخرجه أحمد برقم ٢١٣٩٢، والترمذي برقم ١٩٨٧، وقال: حسن صحيح، والدارمي برقم ٢٧٩١، والحاكم برقم: ١٧٨، وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي).

واتە: پارێزکاریی لە خوا بکە، لە هەموو حاڵێکداو، بەدوای خراپەدا چاکە بکە دەیسڕێتەوەو، بەڕەوشتی جوان لەگەڵ خەڵکیدا ڕەفتار بکە.



هەروەها فەرموویەتی: {الصَّلَوَاتُ الخَمْسُ، وَالجُمُعَةُ إِلَى الجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّراتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتُنِبَتِ الكَبَائِرُ} (أخرجه أحمد برقم: ٩١٨٦، ومسلم برقم: ٢٣٣، والترمذي برقم: ٢١٤).

واتە: پێنج نوێژە -فەرزەکان-و، نوێژی جومعە هەتا جومعەی دوایی و -ڕۆژووی مانگی- ڕەمەزان هەتا ڕەمەزانی دوایی، ئەو خراپەو گوناحانەی دەکەونە نێوانیانەوە، دەیانسڕنەوە، بە مەرجێك دووریی لە گوناحە زلەکان کرابێ.

هەروەها فەرموویەتی: {مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُذْنِبُ ذَنْبَاً، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ لِذَلِكَ الذَّنْبِ إِلاَّ غَفَرَ لَهُ} (أخرجه أحمد برقم: ٤٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح).

واتە هەر مسوڵمانێك گوناحێك بکات، پاشان دەستونوێژ بگرێ و - بە مەبەستی پەشیمان بوونەوە- دوو ڕکات نوێژ بکات، حەتمەن گوناحەکەی دەپۆشرێ.

دیسان فەرموویەتی: {أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسًا، مَا تَقُولُ ذلِكَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ قالُوا: لاَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئًا قَالَ: فَذلِكَ مِثْلُ الصَّلَواتِ الْخَمْسِ يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا} (أخرجه أحمد برقم: ٨٩١١، والبخاري برقم: ٥٠٥، ومسلم برقم: ٦٦٧، والترمذي برقم: ٢٨٦٨، والنسائي برقم: ٤٦٢، والدارمي برقم: ١١٨٣، وابن حبان برقم: ١٧٢٦)، واتە: ئایا ئەگەر بێت و ڕووبارێك بەبەر دەرگای- ماڵی- یەكێكتاندا بڕوات و، هەموو ڕۆژێ پێنج كەڕەتان خۆی لێ بشوات، ئایا هیچ چڵكی پێوە دەمێنێ؟! هاوەڵە بەڕێزەكانی (خوا لێیان ڕازی بێت) گوتیان: هیچ چڵكی پێوە نامێنێ، فەرمووی: دە ئەوە وەك پێنج نوێژە -فەرزە-كان وایە، خوا هەڵەكانیان پێ دەسڕێتەوە.

دەربارەی چۆنیەتی ڕەش داگەڕان و، كەمرە هەڵێنانی دڵ، بەهۆی خراپەو سەرپێچییەكانەوە، پاشان سپی و ساف بوونەوەو پاكبوونەوەی، بە هۆی گەڕانەوە لای خواو داوای لێبوردن كردنەوە، كە یەكەمین هەنگاوی دینداریی و خواپەرستیی، ئینسانی خواپەرستە، فەرموویەتی: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَذْنَبَ كَانَتْ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فِي قَلْبِهِ فَإِنْ تَابَ وَنَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ صُقِلَ قَلْبُهُ وَإِنْ زَادَ زَادَتْ حَتَّى يَعْلُوَ قَلْبَهُ ذَاكَ الرَّيْنُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِي الْقُرْآنِ: كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ} (أخرجه أحمد برقم: ٧٩٣٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي).

واتە: بێگومان بەندە هەر كاتێك گوناحێكی كرد، دەبێتە خاڵێكی ڕەش لە دڵی دا، ئنجا ئەگەر لێی پەشێمان بۆوە، دڵی سپی و ڕوون دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گەڕایەوە سەری، ئەوە ڕەشییەكەی دڵی زیاد دەبێ، هەتا دەكەوێتە سەر هەموو دڵی - و دایدەپۆشێ- و ئەوەش ئەو ژەنگەیە[1] كە

---

(١) (راغب الأصفهاني) (رَيْن)ی بە (صدأ) لێكداوەتەوە، كە بە كوردیی (ژەنگ)ە،

خوای بەرز باسی کردوە: (نەخێر وانیە وەك ئەوان گومان دەبەن، بەڵکو ئەو کردەوە - خراپانە-ی دەیکەن، ژەنگی لەسەر دڵەکانیان پەیدا کردوە).

ئنجا پێویستە ئەوە بگوترێ: کە ئەو تاعەت و چاکەو جۆرە خوا پەرستییانە، هەر کامێکیان بەس لەقەدەر خۆی و، بە ئەندازەی خۆی، دەتوانێ چڵك و چەپەرو ژەنگ و ژاری گوناح و خراپەکان لابەرێ و بیسڕێتەوە، نەك بە موتڵەقیی، هەر وەك چۆن لە شتی ماددییدا، جاری وایە بۆ پاککردنەوەی شتی پیس و چڵکن، تەنیا ئاوی ئاسایی کافییە، بەڵام جاری وایە پێویستە ئاوەکە گەرم بکرێت، ئەگەرنا پەڵەو چڵکەکە لانابات، جاری واش هەیە وێڕای ئاوی گەرم، ماددەیەکی دیکەی وەك صابوون و تایت و فاس و...هتد یش پێویستە، جاری واش دەبێ ئەو چڵك و چەوریی و پەڵەیە ئەسڵەن بە ئاو هەر لاناچێ و خاوێن نابێتەوە، ودەبێ پاککەرەوەیەکی بەهێزتر کە توانای بەسەر ئەو چڵك و پیسییەدا بشکێ- وەك بەنزین- بەکاربهێنرێ.



کۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی سەردارمان (صلی الله علیه وسلم) دێنین، کە بەهێزترین و کاریگەرترین جۆرە خواپەرستیی پاککەرەوەی ئینسان و لابەرو سڕەرەوەی هەڵەو پەڵەو سەرپێچییەکان، پێشانی ئۆممەتەکەی دەدات و، دەفەرموێ: {الْقَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُكَفِّرُ كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ الدَّيْنَ} (أخرجهُ مُسْلِمٌ برقم: ١٨٨٦).

واتە، لەپێناو خوادا کوژران - شەهیدبوون - بێجگە لە قەرز، هەموو شتێك دەسڕێتەوە.

---

بڕوانە (معجم مفردات ألفاظ القرآن) ص ٢١٤.

ئنجا خوایە بە لوتف و کەرەمی خۆت، پلەو پایەی شەهیدییمان پێ ببەخشی و، لە قەرزوقۆڵی خەڵکیش بمانپارێزێ.

بە قسمەت بوونی پلە شەهیدیی، مەرج نیە تەنیا لە ڕێی کوژرانەوە بێ، بەڵکو زیاتر پەیوەستەبە نیازو مەبەست و دڵ و دەروونی ئینسانەوە، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ} (أخرجه مسلم برقم: ١٩٠٩، والحاكم برقم: ٢٤١٢، وقال: صحيح على شرط الشيخين، وأبو داود برقم: ١٥٢٠، والترمذي برقم: ١٦٥٣، وقال: حسن غريب، والنسائي برقم: ٣١٦٢، وابن ماجه برقم: ٢٧٩٧، وابن حبان برقم: ٣١٩٢).

واتە: هەر کەسێك بەڕاستیی پلەی شەهیدیی لە خوای بەرز داوا بکات، خوا دەیگەیەنێتە پلەو پایەی شەهیدان، ئەگەر لەسەر جێگای خۆیشدا بمرێ.



هەروەها فەرموویەتی: ((من طلب الشهادة صِدْقاً،أُعطيها ولو لم تُصِبْهُ)) أخرجه مسلم برقم: ١٩٠٨، هەرکەس ڕاستگۆیانە پلەی شەهیدیی - لە خوا- بخوازێ، ئەگەر شەهیدبوونیشی تووش نەبێ، پێی دەبەخشرێ.

ئەم ڕوونکردنەوەیەشم بۆ ئەوە بوو کە بزانرێ چۆن دوعای گشتی بۆ مسوڵمانان دەکرێ، لەبارەی شەهیدییەوە، چونکە جارێکیان گوێم لە برایەك بوو لە دوعایەکانیدا دەیگوت: خوایە هەموومان لە ڕێی تۆدا شەهید بین! منیش پێم گوت: کاکە گیان! ئەو دوعایە بە قڕچوونی مسوڵمانان دەگەیەنێ، وا مەڵێ، بەڵکو بڵێ: خوایە! پلەو پایەی شەهیدییمان پێ ببەخشە!

## بڕگەی چوارەم

## خواپەرستیی سەرچاوەی هەموو ڕەوشتێكی بەرزوپەسندە

خوای بەرزومەزن و تاك و پاك (تبارك وتعالى) خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرزو هەموو ناوێكی هەرە چاكەو، لە هەموو لەكەو ناتەواوییەك دوورو پاكە، ئنجا وەك پێشتریش لە پێناسەی (عبادة)دا باسمان كرد: خواپەرستییش بریتیە لە (ئەوپەڕی گەردن كەچیی و بەگەورە گرتنی خوا، وێڕای ئەوپەڕی خۆشویستنی)، كەواتە: ئینسان هەتا بۆ خوا پەرستار (عابد)تر بێت، دیارە چاكترو زیاتر گەردنی بۆ كەچ دەكات و بە مەزنی دەگرێ و، پتریش خۆشی دەوێ،

١٠٧ ئنجا ئاشكرایە كە لە ئەنجامی ئەو ملكەچیی و بەگەورە گرتن و خۆشویستنەدا، لێی نزیك دەبێت، وەك خوا فەرموویەتی:

[وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ] (العلق -١٩).

ئنجا لە ئەنجامی نزیكیی بەندەدا، لە خوای بە بەزەیی و بەخشندەش، دەكەوێتە ژێر كاریگەریی ناوە هەرە چاكەكانی و سیفەتە هەرە بەرزو پەسندەكانی، چونكە وەك گوتراوەو بە ئەزموونیش سەلمێنراوە: (المجاورة مؤثرة) - هەڵبەتە مەبەست لە نزیكی لە خوا جل جلالە نزیكیی مەعنەو ییە-، ئنجا زانایانیش لە لێكدانەوەی واتای فەرموودەی: {إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا، مائَةً إِلاَّ وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ (وَزَادَ فِي رِوَايَةٍ أُخْرَى وَهُوَ وِترٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ)}[1].

---

(١)) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رواه البخاري (٢٧٣٦) و (٧٣٩٢)، ومسلم (٢٦٧٧) (٦)

واتە: (بێگومان خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، هەر كەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت و، ئەو تاكەو تاكی خۆش دەوێ)، بەڵێ زانایان لە لێكدانەوەی (من أحصاها)،دا زۆر قسەیان كردوون، بەڵام قسەی بەهێزترو ڕاستتریان ئەوەیە، كە مەبەست لە ژماردنیان: لەبەركردن و، زانینی مەعناو مەبەستیان و، كاركردنە بە پێی داخوازیی ئەو ناوە هەرە چاك و پەسندانە، بۆ وێنە:

هەر كام لە: زانا (علیم)، بە بەزەیی (رحیم)، كاربەجێ (حكیم)، بەخشەر (كریم)، بە توانا (قدیر)، زاڵ (عزیز)، بەهێز (قوي)، هێمن (حلیم)،...هتد، ئینسان هەم بێژە (لفظ)ەكانیان و، هەم مەعناو مەبەستەكانیان لەبەر بكاو بزانێ و، لەقەدەر خۆی هەوڵ بدات زانیاریی و بەزەیی و حیكمەت و بەخشندەیی و تواناو دەستەڵات و هێزو ئارامیی و...هتد لە خۆیدا بهێنێتە دی، ئەوە لە لایەكەوەو، لە لایەكی دیكەشەوە: هەمیشەو دایم هەست بە زانیاریی و بەزەیی و حیكمەت و كەرەم و تواناو دەستەڵات و هێزو هێمنیی و... هتدی، بێسنووری خوای پەروەردگار بكات و، هیچ كاتێك لەو ناوە چاك و سیفەتە پەسندو موتڵەقانەی بێئاگا نەبێت.

بەڵام دەبێ لە دوو مەسەلەی گرنگ وریا بین:

**یەكەم:** ئەو ناو و سیفەتانەی ئینسان، هەر لەقەدەر خۆینی و بەشداربوونی ئینسان لە هەندێك لە ناو و سیفەتەكانی خوای بێوێنەدا، ئەوە ناگەیەنێ كە یەكسان و وەك یەكن، بەڵكو هەركامێكیان بە

وزادا: (مائة إلا واحداً) بعد: (اسماً)، وعندهما زیادة أخری: (وهو وتر یحب الوتر)، وفي روایة للبخاري (٦٤١٠) ومسلم: (من حفظها).

ئەندازەی خۆی، ئینسان بە ئەندازەی بەندایەتیی و خواش (تبارك وتعالی) لەقەدەر خوایەتیی، کە بێگومان پێوانەو کێشانە ناکرێن.

**دووەم:** بەشێك لە ناو و سیفەتەکانی خوا، بە هیچ جۆرێك لە بەندە (عبد) ناوەشێنەوەو، کەم و زۆریان تایبەتە بە خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارەوەو بۆ ئینسان ناگونجێن، وەك (دروستکەر) (الخالق)، پەروەردگار (الرب)، پەرستراو (الاله)، ناچارکەر (الجبّار)، خۆ بە گەورە زان (المتكبِّر)، گەردن پێکەچکەر (القهّار)، ڕۆزی دەر (الرازق)، بێنیازو جێی نیاز (الصمد)...هتد.

بەڵێ خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!



لە ئەنجامی چاك پەرستنی خوای پەروەردگارو بەندایەتیی بۆ کردنیدا، بێگومان بەندە لە خوا نزیکترو پێی ئاشناتر دەبێت، ئنجا لە ئاکامی ئەو نزیکیی و شارەزایی و ئاشناییەش، بەندەی پەرستار (عابد) لە سیفەتە جوان و ڕەندەکان و، ناوە بەرزو پەسندەکانی خوای پەروەردگار بەهرەمەند دەبێت، ئایا ئەگەر دۆستایەتیی و نزیکی بابای عەتر فرۆش - کە بۆ هاوەڵی باش بە نموونە هێنراوەتەوە- ببێتە هۆی بۆن خۆش بوون، یان لانی کەم بۆنی خۆش بۆ هاتنی ئینسان، پەرستن و بەندایەتیی و نزیکیی لە خوای پەروەردگاری سەرچاوەی هەموو بەرزیی و چاکییەك، نابێتە هۆی (بەرزبوونەوە)و (چاکبوون)ی بەندە؟! ئایا ئەگەر دروستراوەکان (المخلوقات) بە هۆی نزیکییانەوە لە یەکدی، کارتێکران و کارتێکردن (التأثر والتأثير) یان لە نێواندا ڕوودەدات، دروست کراو و دروستکەر (المخلوق والخالق) حەوجار حەوجار لە نێوانیاندا ڕوونادات؟!.

بێگومان: با، هەر بۆیەش کە دەبینین: بەندە ڕەسەن و ڕاستەقینەکانی خوای بەرزو پاك و تاك، بە ئەندازەی ئیمان و تەقوا، واتە: بەندایەتییەکەیان، بە سیفەت و ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان دەڕازێنەوە و، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو دەبنە هۆی پەروەردەبوون و ڕازاندنەوەی خەڵکی بن دەست و دەوروبەریشیان، ئەوە لە لایەك و، لە لایەکی دیکەشەوە: بەندە پەرستارو چاکەکارەکانی خوا، نەك هەر لە خراپە و خوو و خدەی نزم و پەست دوورن و، سەرچاوەی پیسیی و بەدکاریی، کە شەیتانی نەگبەت و بێخێرە، زەفەریان پێ نابات! بەڵکو شەیتان بە شەیتانیی خۆی، ناوێرێ توخنیان بکەوێ و، لە ترسانیان ڕادەکات و خۆی حەشار دەدات، ئەوەتا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕوو بە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەفەرموێ: {إِيهًا يَا ابْنَ الْخَطَّابِ! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا لَقِيَكَ الشَّيْطَانُ سَالِكًا فَجًّا قَطُّ إِلَّا سَلَكَ فَجًّا غَيْرَ فَجِّكَ} (أخرجه أحمد برقم: ١٥٨١، والبخاري برقم: ٣٤٨٠). ١١٠

واتە: ئەها ئەی کوڕی خەتتاب! سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە، هیچ کاتێك شەیتان لە ڕێیەکدا تووشت نەبووە، مەگەر ڕێیەکی دیکەی جیا لە ڕێی تۆی گرتۆتە بەر - واتە خۆی لێت لاداوە- کەواتە: بە ئەندازەی ئەوە کە بەندە لە خوا نزیك دەبێ و بەندایەتیی بۆ دەکات، شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوەو توخنی ناکەوێت!!

کۆتایی ئەم باسەش بەم ئایەتە بە پێزە دێنین:

[يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ] (الحج- ٧٧).

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕکووع - بۆ خوا- بەرن و کڕنووش بەرن و، پەروەردگارتان بپەرستن و، هەرچی چاکەیە بیکەن، بۆ ئەوەی بە مراد بگەن و سەرفراز بن.

وەك دەبینین: خوای کاربەجێ دوای ئەوەی فەرمان بە ئیمانداران دەکات بە ئەنجام دانی بەرزترین و تایبەتییترین جۆری خوا پەرستیی کە نوێژە —چونکە ڕکووع بردن و کڕنووش بردن وێکڕا بەس لە نوێژدا دەبن- ئەوجار بە گشتی فەرمانیان پێ دەکات بە خواپەرستیی، ئنجا دوای ئەوە فەرمانیان پێدەکات بە چاکەکاریی، کە دیارە چاکەکاریی (فعل الخیر) تێکڕای ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزو پەسندەکان دەگرێتەوە، کە ئینسان هەڵس وکەوت و ڕەفتاریان پێ لەگەڵ خەڵك و کۆمەڵگادا دەکات، کە بێگومان ئەمانیش هەر بەشێك و جۆرێکن لە خواپەرستیی و بەندایەتیی کردن بۆ خوا، بەڵام، بە ئیعتیبارێکی دیکەو لە ڕوویەکی دیکەوە، زادەو بەرهەم و شوێنەواری خواپەرستیی (عبادة)ن، چونکە زیاتر پەیوەندییان بە خەڵکەوە هەیە.

سا خوایە! بە لوتف و کەرەمی بێسنووری خۆت، بمانکەیە خواپەرستێك کە هێندە بە تۆ ئاشناو، لە تۆ نزیك و، بۆ تۆ دۆست بین، کە لە سایەی بەندایەتییمانەوە بۆ تۆ، ببینە جێگای تێدا درەوشانەوەو، تێدا ڕەنگدانەوەی سیفەتە پەسندەکان و ڕەوشتە ڕەندەکان و، شەیتانی پیس و نەگریسیش، کە ماك و سەرچاوەی هەرچی سیفەتی نزم و خوو خدەی پیس و پەستە، بەهۆی نزیکییمانەوە لە تۆ، عومەر ئاسا لێمان دوور بێ و، ڕێی لە ڕێمان نەکەوێ و، هەر توخنمان نەکەوێ.



## بڕگەی پێنجەم

## تاقە ڕێی لە دۆزەخ قوتاربوون و، چوونە بەهەشت: خواپەرستییە

بەڵێ خوێنەرانی بەڕێز!

یەکێك لە شتە ئاشکراو ڕوونەکانی ئیسلام، ئەوەیە کە ئەگەر خوای کار بەجێ لە دنیادا بەزەیی و چاکەو نازو نیعمەتەکانی خۆی، کردوە بە سایەو سێبەری هەموو بەندەکانی بە کافرو مسوڵمان و بەدکارو چاکەکارەوە، وەك سفرەو خوانێکی ڕازاوە بۆ هەموو لایەکی بەبێ جیاوازیی، ڕاخستوەو وای کردوە، بۆ ئەوەی هەموویان وەك یەك و بێ جیاوازیی هەل و دەرفەتی تاقیکردنەوەیان بۆ بڕەخسێ و، زەمینەی (إبتلاء)یان هەموار بێ و، هیچ کەس بواری بیانوو گرتن و پرتەو بۆڵەی بەجێ و بەڵگەداری نەبێ و، دەستی پیسی خۆی بە خەڵکی نەسڕێ، بەڵێ ئەگەر لە دنیادا حاڵ و باڵ ئاوایە، ئەوە لەدوارۆژدا زۆر جیایە، چونکە ئەوێ جێگای ئەنجام وەرگرتنەوەو پاك و پیس لێك هەڵاواردن و، چاکەو خراپە کێشان و ژماردنەو، بەزەیی و بەخشش و چاکەو نازو نیعمەتە بێسنوورەکانی خوا، کە لە بەهەشتدا تەجەللا دەکەن، تایبەت و تەرخانکراوی دۆستە بڕوادار و پەرستارو چاکەکارو وەفادارو پارێزکارەکانن و، تووڕەیی و خەشم و تۆڵەو ئازارو ئەشکەنجەو جەزرەبەی بێئامانیشی، ملۆزم و تاپۆی دوژمن و ناحەزە بێ بڕواو لاڕێ و خراپەکارو سپڵەو تاوان بارەکانن، بەڵێ ئەگەر لە دەمی تاقیکردنەوەدا، دادگەریی ئەوە بێ


۱۱۲


کە ئینسانەکان بە چاك و خراپەوە، بەیەك چاو سەیر بکرێن و، لە بارودۆخ و کەش و هەوایەکی یەکسان دا دابنرێن، بۆ ئەوەی بێجگە لە ماهیەتی خۆیان و، لە کردارو ڕەفتاریان بەولاوە، هیچ شتێکی دیکە کاریگەریی نەبێ لەسەر ئەنجام و پەرێزی تاقیکردنەوەکەیان، ئەوە بێگومان لە کاتی بڕوانامە (شهادة) پێدرانەوەو، ئەنجام و بەرهەم وەرگرتنەوەدا، دادگەریی و حیکمەت ئەوە دەخوازێ، کە هەر کەسە وەك لێی دەوەشێتەوە، ڕەفتاری لەگەڵ بکرێ و، ((مەڕ بەپێی خۆی و بزن بە پێی خۆی هەڵبواسرێ))و، هەر کەسە لە بڕوادارانی چاکەکارو وەفادارو، بێبڕوایانی بەدکارو سپڵەولار، لە شوێنی شایستەی خۆیاندا دابنرێن و، نیشتەجێ بکرێن.





ئێستاش با سەرنجی چەند دەقێکی قورئانی بەرێز بدەین، بزانین چۆن ئەو ڕاستییانەی لە سەرێ خستماننە ڕوو، باس دەکەن:

**یەکەم: دەربــارەی دنیــاو ئەهــلی دنیــا بەگشــتی:**

أ- [ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْفُلْكَ لِتَجْرِىَ فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلْأَنْهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾ وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ ۚ وَإِن تَعُدُّوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ ] (إبراهیم -٣٢، ٣٣، ٣٤).

واتە: ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون و، لە ئاسمانێ ئاوی ناردۆتە خوارێ، بەو ئاوە میوەجاتی پێ بەرهەم

هێناوە، کە بژیو بێ بۆتان و، کەشتی بۆ ڕام کردوون کە بە فەرمانی خوا لە دەریادا دەڕۆن و، ڕووبارەکانی بۆ مەیسەر کردوون و. خۆرو مانگی بۆ دەستەمۆ کردوون کە بەردەوام کاردەکەن و، شەو و ڕۆژی بۆ مەیسەر کردوون و، لە هەرچی -بەزمانی حاڵ- داواتان کردوە، پێی بەخشیون و، ئەگەر چاکەکانی خوا سەرژمێر بکەن، بۆتان ناژمێردرێن بەڕاستیی ئینسان -ی کافر- زۆر ستەمکارو سپڵەیە.

ب- [وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ] (الأسراء -٧٠).

واتە: بێگومان ڕێزو حورمەتمان لە وەچەی ئادەم گرتوەو، لە ئیشکانیی و دەریادا هەڵمان گرتوون و، لە ڕۆزییە چاك و پاکەکان بژیومان داونێ و، بەسەر زۆر لەوانەدا کە دروستمان کردوون، هەڵمان بژاردوون.

١١٤

ج- [وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ] (الأنبياء -١٠٧).

واتە: - ئەی موحەممەد!- تۆمان تەنیا وەك بەزەییەك بۆ تێکڕای جیهانییان ڕەوانە کردوە.

وەك دەبینین: بەزەیی و بەخششی ماددیی و مەعنەویی خوای پەروەدگارو کاربەجێ کە لە: (ئاسمانەکان و زەوی، باران، بەروبووم و میوەجات، کەشتی، ڕووبارەکان، خۆرو مانگ، شەو و ڕۆژ، هەرچی پێداویستیی ژیان و گوزەرانی ئینسانە لەسەر زەوی، نازو نیعمەتە لە ژمێر نەهاتووەکان، ڕێزو حورمەت لێگیران و، ڕەخسان و ڕامکرانی هۆیەکانی هاتووچۆی ئینسان و، بارو سواری لە ئیشکانیی و دەریادا،

ڕۆزیی و بژیوە چاك و پاكەكان، بەرزكرانەوەو هەڵبژێردران بەسەر زۆربە یان تێكڕای دروست كراوەكاندا) تەجەللای كردوە، سەرجەم مرۆڤەكانی بە چاك و خراپەوە گرتۆتەوەو، هیچ كەس نەبوێرراوەو هەڵنەوێردراوە!، كەواتە: ڕاستە كە بەزەیی و چاكەو لوتف و كەرەمی خوا، لە هەردوو ڕووی ماددیی و مەعنەوییەوە، گشتگیرە بۆ تێكڕای ئینسانەكان، لەم ژیانە دنیاییەدا، بەبێ جیاوازیی.

**دووەم: دەربارەی دواڕۆژو خەڵكی چاكەكارو بەدكار:**

أ- [إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾] (الأنفطار ١٤،١٣).



واتە: بێگومان چاكەكاران لە نازو نیعمەت - ی بەهەشت-دان و، بێگومان تاوان باران لە نێو كڵپە-ی دۆزەخ- دان.





ب- [وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾] (الزمر ٧١ -٧٤).

واتە: ئەوانەی بێ بڕوان دەستەدەستە بەرەو دۆزەخ بەڕێکران، هەتا کاتێك گەیشتنە لای، دەرگاکان کرانەوەو، دەرگەوانەکانی پێیان گوتن: ئەدی چەند پێغەمبەرێکتان لە خۆتان نەهاتبوونە لاتان و، ئایەتەکانی پەروەردگارتانیان دا بەسەردا دەخوێندنەوەو، لەم دیدارەی ئەمڕۆکەتان ئاگاداریان دەکردنەوە؟! -کافرەکان- گوتیان: با، بەڵام فەرمانی {خوا} بە ئەشکەنجە دران لەسەر کافران پێویست بوو بوو. -پێیان- گوترا: دەبچنە نێو دەروازەکانی دۆزەخەوەو، تێیدا هەمیشەیی بن، خراپترین جێگاش جێگای خۆ بەزلگرانە.

ئەوانەش کە پارێزکارییان لە بەرانبەر پەروەردگاریان دا کردبوو، کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو بەهەشتێ بەڕێ کران. هەتا کاتێك گەیشتنە لای و دەرگاکانیشی ئاوەڵا کرابوونەوە، دەرگەوانەکانی پێیان گوتن: سەلامتان لێ بێ، ئێوە -بەهۆی بەندایەتیی و خواپەرستییتانەوە- پاك و چاك بوون، دەبچنە نێو بەهەشتەوە بەهەمیشەیی، -پارێزکارانیش- گوتیان: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنی لەگەڵ بردینە سەر و، سەر زەمینی -بەهەشتی- کردە میراتمان، لە کوێ حەز بکەین تێیدا نیشتەجێ دەبین.

بەڕاستی ئەم - بەهەشت -ە، چاکترین پاداشتی ئیشکەرانە {لە پێناوی خوادا}.

ج- [إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾] (البينة ٦-٨).

واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان لە خاوەن کتێبەکان و هاوبەش - بۆ خوا- دانەرەکان، بەهەمیشەیی لە ئاگری دۆزەخ دان {چونکە} ئەوانە خراپترینی دروستکراوان {ی خوا}ن ، بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داون، ئەوانە چاکترینی دروستکراوەکان ـی خوا-ن، پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان: باغاتێکی بەردەوامن و، چەندان ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، هەتا هەتایە تێیان دان بە هەمیشەیی، خوا لەوان ڕازییەو، ئەوانیش لەو ڕازیین ئەو -پاداشت-ەش بۆ کەسێکە کە لە پەروەردگاری ترس و سامی هەبێ.

خوێنەرانی خۆشەویست!



وەك دیتمان: لە ڕۆژی دواییدا بە پێچەوانەی دنیاوە، خوای کاربەجێ و بەخشندەو دادگەر، ڕەحمەت و بەخشش و چاکەو نازو نیعمەتەکانی خۆی، تایبەت کردوون، بە ئەهلی ئیمان و چاکەوەو، ئەهلی کوفرو خراپەی نەك هەر بێبەش کردوە، بەڵکو سزاو جەزرەبەی پڕ بە پێستیشی بۆ داناون و، ڕووڕەش و سەر بەهەشی کردوون، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە: کە خوای دادگەرو بەخشەر، بەزۆریی پاداشتی خۆی -کە ڕەزامەندیی و بەهەشتە- لەژێر ناو و نیشانی (ئیمان)دا بۆ بەندە دۆست و وەفادارەکانی باسکردوەو، سزاو تۆڵە کەیشی کە تووڕەیی و دۆزەخە - بە زۆریی لەژێر ناو و نیشانی (کوفر)دا بۆ ناحەزو دوژمنە لاڕێ و بەدکارەکانی باسکردوە، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە (ئیمان) یەکەمین و گەورەترین هەنگاوی بەندایەتیی و خواپەرستییەو، بەبێ ئیمانێکی ڕاست و دروست، ڕەنجی ئینسان بەبایەو، هەوڵ و تەقەللای بەکەڵك نایە، (کوفر)یش گەورەترین و یەکەمین هەنگاوی لاساریی و، لە خوا یاخیی بوون و، خۆ لێبایی بوون و، ڕێ لێتێکچوونەو



بێجگە لە کوفر - کە شیرك یەکێك لە جۆرەکانیەتی- هەر گوناح و هەڵەیەك هەرچەندە زل بێ، ڕێی تێدەچێ چاوپۆشیی لێ بکرێ و، هەر چۆن بێ، پاش سزاو جەزرەبەو تۆڵە، بابای خاوەن ئیمان هەر قوتاری دەبێ! وەك لە چەندان فەرموودەی پێغەمبەردا (صلی الله علیە وسلم) باسکراوەو داکۆکیی لەسەر کردوە.

بەڵام دەبێ لەو ڕاستییەش بێئاگا نەبین، کە چاکەکاریی و پارێزکاریی، زادەو بەرهەمی ئیمانەو، ئیمانیش پێی زیاد دەکات و گەشە دەکات و، بەپێچەوانەوە: خراپەکاریی و تاوانباریی، پەرێزو بەرهەمی کوفرەو، دەشبێتە هۆی زیاتر ڕۆچوونی کوفر لە کافرانداو، کزبوونی ئیمانیش لە بڕواداران دا[1].



کۆتایی ئەم باسەش، بە هێنانەوەی دوو دەقی قورئانی بەڕێزو، تێبینییەك، دێنین:

أ- [إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ] (الأعراف -٥٦).

---

(١) ئەم ڕستەیە لە زۆربەی کتێبە عەقائیدییەکانی زانایانی پێشینان دا هاتوە: (الإيمان: قول وعمل، قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح، يزيد بالطاعة وينقص بالمعصية) واتە: ئیمان گوتەو کردەوەیە، گوتەی دڵ {کە بەڕاست زانین (تصدیق)ە} و گوتەی زمان {کە دان پێدا هێنان (إقرار)ە} و کردەوەی دڵ {کە ملکەچیی و قبووڵ کردن و خۆشویستنە} و، کردەوەی ئەندامەکانە {کە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکان و خۆدوور گرتن لە قەدەغە کراوەکانە}و ئیمان بە فەرمانبەریی (طاعة) زیاد دەکات و، بەسەرپێچیی (معصیة) کەم دەکات.

بۆ وێنەیەکی کتێب و سەرچاوەکانی زانایانی پێشین (سلف) لەو بارەوە، سەرنجی کتێبی: (شرح أصول آعتقاد أهل السنة والجماعة) بدە، بەرگی (٢) کۆتایی بەشی (چوارەم) و، بەرگی (٣) بەشی پێنجەم، دانراوی: الشیخ الحافظ أبي القاسم هبة الله أبن الحسن بن منصور الطبري اللالكائي.

واتە: بێگومان بەزەیی خوا لە چاکەکەرانەوە نزیکە، چەمکی پێچەوانەی (مفهوم المخالفة)ی ئەو ئایەتە بە پێزەش، ئەوەیە کە بەزەیی خوا، لە خراپەکارانەوە نزیك نیەو دوورە.

ب- [وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ ...] (الأعراف ١٥٦، ١٥٧).

واتە: بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام بەس بۆ ئەوانەی تۆمار دەکەم کە پارێز دەکەن و، زەکات دەدەن (یان: خۆیان تەزکیە دەکەن)[1] و، ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانمان هەیە، ئەوانەی شوێن ڕەوانەکراوی نەخوێدەوار دەکەون...

119

هەڵبەتە نزیکیی ڕەحمەتی خواو نووسران و، تۆمارکردنی بۆ بڕواداران، هەم دنیاو هەم دوارۆژیش دەگرێتەوە، هەرچەندە زیاتر مەبەست دوارۆژە، چونکە ڕەحمەتی گشتی خوای میهرەبان و بەخشندە، تەجەللا ماددیی و بەرهەستەکەی نازو نیعمەتە ماددییە ئاشکراو پەنهانەکانی خوان، کە هەموو پێداویستییەکانی ژیان و گوزەرانی ئینسان دابین دەکات و، تەجەللا مەعنەوییەکەیشی، بریتیە

---

(١) لێرەدا مەبەست لە (زکاة) تەزکیەی نەفسە، نەك ماڵ و سامان، بەخشین بێ، چونکە سوورەتەکە مەککەییەو، زەکات دانیش لە مەدینە فەرز بووە.
بەڵام دەشگونجێ مەبەست ماڵ بەخشین بێ بەگشتی، چونکە ئەوە لەمەککەش هەر هەبووە.
ئێستاش (١٦/ڕەجەب/١٤٤١ك - ١١/٣/٢٠٢٠ز) دەڵێم: زیاتر واپێدەچێ مەبەست سامان بەخشین بێ چونکە لە مەککەش ئەسڵی: نوێژو زەکات و ڕۆژوگرتن، هەبوو.

لەو بەرنامە تێرو تەواوەی خوا کە بیر خەرەوەو ڕێڕوونییکەرە بۆ سەرجەم ئینسانەکان، بەبێبڕوا بڕوادارەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

١- [إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ] (التكوير -٢٧).

٢- [شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ] (البقرة- ١٨٥).

بەڵام خوای بەخشەرو هیدایەتدەر، ڕەحمەت و نیعمەتێکی دیکەی تایبەتیی هەیە بۆ بڕواداران، کە غەیری ئەوانی تێدا بەشدار نیە، کە بریتیە لەو هیدایەت و بەرچاو ڕوونیی و ئارامیی و ئۆخژن ڕشتنە نێو دڵ و، بە دەنگەوە هاتن و، مشوور بۆ خواردن و، پشتگرتن و، بەرگریی لێکردن و... هتدە، کە لە ئەنجامی ئیمان و تەقوایەکەیانەوە، خوای دادگەرو بەخشەر پێیان دەبەخشێ، ئەمەش چەند دەقێك لە قورئانی بەرێز، بۆ هەرکام لەو جۆرە ڕەحمەت و نیعمەتانەی خوای پەروەردگار: ١٢٠

١- [الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢] (البقرة -١،٢).

واتە: ئەلیف لام میم، ئەو کتێبە دوودڵیی تێدا نیە ڕاستەڕێ کارە بۆ پارێزکاران.

ئنجا وەك توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەم جۆرە هیدایەتەی کە تایبەت کراوە بە پارێزکارانەوە، جیایە لە هیدایەت بوونی قورئان بۆ تێکڕای خەڵکی، چونکە هیدایەتدانی گشتی بۆ خەڵکی، ڕێگای ڕاست پیشاندانیانە، بەڵام هی پارێزکاران، دەست گرتنیان و دڵ وەرچەرخاندنیانە بەرەو ڕێی ڕاست و ڕەزامەندیی خوا.

٢- [.. يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ..] (الأنفال -٢٩).

واتە: ئەی بڕوادارینە! ئەگەر پارێزكاریی لە بەرانبەر خوادا بكەن، ڕۆشناییەكی جیاكەرەوەتان بۆ دەڕەخسێنێ.

٣ـ [هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِى قُلُوبِ ٱلْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوٓاْ إِيمَـٰنًا مَّعَ إِيمَـٰنِهِمْ ...] (الفتح -٤).

واتە: خوا ئەو زاتەیە كە ئارامیی ڕشتە نێو دڵی بڕواداران، تاكو لەگەڵ ئیمانەكەیان دا، ئیمان زیاد بكەن.

٤ـ [إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّى مُمِدُّكُم ...] (الأنفال -٩).

واتە: یاد بكەنەوە! كاتێك هاوارتان بۆ پەروەردگارتان دەكرد، ئەویش وەڵامی دانەوە، كە من پشتگیرییتان دەكەم...

١٢١

٥ـ [ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ..] (البقرة -٢٥٧).

واتە: خوا مشوور خۆرو دۆستی ئەوانەیە كە بڕوایان هێناوە، لە تاریكاییەكان بەرەو ڕۆشنانی قوتاریان دەكات .

٦ـ [ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ...] (الزمر-٣٦)، ئایا خوا بەس نیە بۆ - پشتیوانیی- بەندەكەی؟!.

٧ـ [إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ..] (الحج -٣٨).

واتە: بێگومان خوا لەسەر ئەوانە دەكاتەوەو بەرگرییان لێ دەكات، كە بڕوایان هێناوە.

## بڕگەی شەشەم

## خواپەرستیی ڕۆڵێكی گرنگ دەگێڕێ، لە پێكەوە جۆشدانی ڕیزەكانی مسوڵمانان و، تۆكمەو توندو تۆڵكردنی كۆمەڵگادا

گرنگترین دەستەبەركەر (ضامن)ی سەركەوتن و بە ئامانج گەیشتن و بەرەو پێش بردنی كۆمەڵگایەكی ئیسلامیی، بریتیە لە تۆكمەیی و توندو تۆڵیی و پێكەوە جۆشدراویی ڕیزەكانیان و، پێكەوە پەیوەستیی توێژەكانیان، خواپەرستیی (عبادة)یش گەورەترین هۆكارەو باشترین ڕۆڵ دەگێڕێ لەو بارەوە، چونكە كۆمەڵێك كە هەموو ئەندامەكانی بە وردو درشتەوە، خۆیان بە بەندەی یەك خوای پەرستراو و، بەندایەتیی بۆكراو دەزانن و، هەموویان كڕنووش بۆ یەك پەرستراو دەبەن و، ڕووی نیازو مەبەستەكانیان تەنیا لەو دەكەن و، جگە لەو هیچ كەس و هیچ سەرچاوەیەكی دیكە بە بەرنامەدانەر (شارع)و فەرمانڕەوا (حاكم)ی خۆیان نازانن و بە كورتیی: تەنیا ئەو دەپەرستن و پشتیان بەس بەو دەبەستن و، بۆ جێبەجێكردنی: (إياك نعبد وإياك نستعين) دەست لەسەر سینگ و گیان لەسەر لەپی دەستن، بەڵێ كۆمەڵگایەكی ئاوا، بێگومان لەسەر بنچینەی مەحكەم و دامەزراوی بەندایەتیی (العبودية)، بەهێزترین جۆری پێكەوە پەیوەستیی و، یەك هەست و نەستیی و، یەك هەڵوێستیی و برایەتیی (الأخوة)یان، لەنێودا پەیدا دەبێ، كە لە هیچ كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی دیكەدا وێنەی نەبێ، وەك حەقیقەت و واقیعییەت (مصداقية)ی ئەو جۆرە برایەتییە بە چاكترین و تەواوترین شێوەی لە كۆمەڵی یەكەمی مسوڵمانان لە شاری مەككەو، پاشان لە كۆمەڵگای یەكەمی مسوڵمانان لە شاری

مەدینەدا، دەبینین کە پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) لەسەر بناغەی خوا بەیەکگرتن و خواپەرستیی (التوحید والعبادة) تێی گەیاندن و پێی گەیاندن و لەنێو خۆیاندا، بوونە چاکترین خوشك و براو بۆ خەڵکی دیکەش بوونە ڕووناکیی و چرا، خوا لێیان ڕازی بێت و بە ڕەزامەندیی و بەخششی خۆی ڕازییان بکات و، پلەو پایەیان زیاترو چاکتر بەرزو بڵند بکات.

کۆمەڵگای مسوڵمان لە سۆنگەی ئەوەوە کە تاك تاکی ئەندامەکانی لەسەر یەك بناغەی عەقیدەیی و، لەنێو یەك قاڵب و بۆتەی خواپەرستیی و، لە بازنەو جوغزی، یەك ڕەوشت و ڕەفتاردا، کە عەقیدەی ئیسلامیی و، خواپەرستیی ئیسلامییانەو، ڕەوشت و ڕەفتاری مسوڵمانانەیە، کەسایەتییان بنیات نراوەو پەروەردە کراوە، کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی پێکەوە گونجاو و جۆش دراو و، یەك هەست و نەست و، هەڵوێست لەگەڵ یەك پەیوەستن، وەك چۆن ئەو خشتانەی دیواری خانوویەکیان لێ پێك دێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەیەك شێوەو لە یەك کەرەسە دروست کراون و لە قاڵب و بۆتەیەکدا داڕێژراون و، زۆرباش پێکەوە ڕیز دەبن و لەگەڵ یەك پەیوەست دەبن.

123

دیارە پێغەمبەری پێشەواو دانامان (صلی الله علیه وسلم) بە خۆڕایی نیە کە کۆمەڵ و کۆمەڵگای بڕواداری، بە خشتە پێکەوە جۆشدراو و تێك ترینجاوەکانی دیوار، چواندوە: {الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً} (أخرجه البخاري برقم: ٢٣١٤، ومسلم برقم: ٢٥٨٥).

واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك خانوو وایە، هەندێکی هەندێکی مەحکەم دەکات.

هەروەها بۆیە كۆمەڵی مسوڵمان و كۆمەڵگای مسوڵمانی وەك جەستەیەك داناوە، كە هەر كام لە ئەندامانی ئەو جەستەیە، بە پەرۆشەو دڵسۆزە بۆ ئەندامەكانی دیكە، وەك فەرموویەتی: {مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ، مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى} (أخرجه أحمد برقم ١٨٤٠٤، ومسلم برقم: ٢٥٨٦).

واتە: وێنەی بڕواداران، لە یەكدی خۆشویستن و بەزەیی پێكدا هاتنەوەو پەرۆشییان بۆ یەكدی وەك جەستەیەكە، كە ئەگەر ئەندامێكی ئازاری بوو تێكڕای جەستەكە هاودەردی دەكات بەشەو نخوونیی و تا لێهاتن.

بەڵێ هەروەك چۆن یەك ڕووح، هەموو ئەندامانی جەستەیەك پێكەوە دەبەستێت و، بەهۆی ئەو ڕووحەوە، چاكترین هاوكاریی و تەباییان لە نێواندا هەیە، ئەندامانی كۆمەڵ و كۆمەڵگایەكی ئیسلامییش، یەك ڕووح، كە ڕووحی ئیمان و خواپەرستیی و بەندایەتیی كردنە بۆ خوا، وەك دەزووی تەسبیحێك، پێكیانەوە دەبەستێ و، ڕیزیان دەكات و ڕێكیان دەخات.

ئێستاش با بۆ نموونە سەرنجی هەشت (٨) جۆرە خواپەرستیی بدەین، داخۆ چۆن چۆنی دەبنە هۆی پێكەوە جۆشدران و تۆكمەكردنی كۆمەڵ و كۆمەڵگای ئیسلامیی:

### ١-نـوێـــژ:

نوێژ كە بە گەورەترین و چاكترین جۆرە خواپەرستیی شەخسیی دادەنرێ، كاریگەرترین دەوریشی هەیە، بۆ پێكەوە گرێدانی دڵی بڕواداران و بەهێزكردن و مەحكەم كردنی ڕیزەكانیان بە تایبەتیش كە نوێژ لە شەو و ڕۆژدا پێنج كەڕەتان دووبارە دەكرێتەوەو، بە

کۆمەڵ کردنی لەلای زۆر لە زانایان، فەرزی عەین، یان کیفایەیەو، لەلای هەندێکیشیان سوننەتێکی داکۆکیی لەسەرکراو (مُؤَكَّدة)ەو، نوێژی بە کۆمەڵی (پێنج) فەرزەکانیش: بە بیست حەوت (٢٧) پلە بە چاکتر دانراوە لە نوێژی تاك و[1]، بەهۆی نوێژی بە کۆمەڵەوە، مسوڵمانان ناچارن لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج کۆببوونەوە بکەن و، لە هەفتەیەکدا لەسەر ئاستی شارو ئاوەدانیی بە هۆی نوێژی جومعەوە، لەسەریان پێویستە کۆبوونەوەی هەفتانەو، بەهۆی نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربانیشەوە لەسەریان فەرزە، یان لانی کەم سوننەتە، دووجار کۆبوونەوەی ساڵانە بکەن، دیسان چۆنیەتی نوێژ کردنەکە، کۆمەڵێك ئەدەب و ڕێوڕەسمی هەن، کە پێویستە نوێژکەران ڕەچاویان بکەن، ئنجا ئەمانە هەموویان دەورێکی یەکجار کاریگەر بۆ نوێژ دەرەخسێنن، لە بواری پێکەوە بەستن و جۆشدانی مسوڵمانان لە نێو خۆیاندا.



## ٢-مــاڵ بەخشــین:

ئەمیش چ جۆری فەرزی عەینی، کە زەکاتەو، غەیری زەکاتیشە، لە هەندێك حاڵەتی نائاساییدا، کە زانایان بە وردیی باسیان کردوون و، چ جۆری فەرزی کیفایەی و، چ جۆری سوننەتی، ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ دەگێڕێ لە چەسپاندنی برایەتیی و، بەهێزکردنی خۆشەویستیی و، لابردن و نەهێشتنی هۆکارەکانی ناتەبایی و ناکۆکیی نێوخۆ، وەك حەسوودیی و بوغزو کینەو...هتد.

---

(١) (صلاة الجماعة أفضل من صلاة الفَذِّ بسبع وعشرين درجة) رواه البخاري: ٦٤٥، ومسلم: ٦٥٠.

### ٣-ڕۆژوو گرتــن:

ڕۆژوو گرتن، بە هەموو جۆرەکانی فەرزو سوننەتیەوە، دیسان کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە ڕووی برایەتیی و هەست بە دەردو ئازاری یەکدی کردن و، بەتەنگ یەکدییەوە بوون و، دەستبار بۆ یەکدی گرتن، بە تایبەت لە مانگی ڕەمەزان دا، کە کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامیی بەتێرو برسیی و، هەژارو دەوڵەمەندو، پادشاو گەداوە، لەسەریان فەرزە برسیی و تینوو بن و، بەلای کەمەوە لە ساڵێدا مانگێك دەوڵەمەندەکان هاودەردیی لەگەڵ نەدارەکاندا بکەن و، لە برسیەتیی و نارەحەتییدا یەکسان بن و، هەست بە ئێش و ژان و مەینەتییان بکەن، بۆ ئەوەی وێڕای حوکمی یاسای ڕواڵەتیی[1]، هاندەرێکی دەروونیی و ویژدانییشیان هەبێت بۆ هاوکاریی و دەست گرتنیان.



### ٤-حــەج کردن:

حەجیش کە وەك هەرکام لە شایەتمان و نوێژو زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان، یەکێکە لە پێنج پایە بنەڕەتییەکانی ئیسلام و، وێڕای لایەنە مەعنەویی و ئەخلاقیی و فیکریی و جیهادیی و ئابووریی... هتدیەکانی، کۆنگرەی سیاسیی ساڵانەی ئۆممەتی ئیسلامییە، لەسەر ئاستی هەموو گەلانی ئۆممەتی ئیسلامیی و نیشتیمانی ئیسلامییدا، ئەگەر ڕژێمە تاغووتییەکان لێبگەڕێن، ڕۆڵێکی یەکجار کاریگەر

---

(١) چونکە زۆر لە زانایان کە یەکێکیان (اِبن حزم الأندلسي) دەڵێن: لەسەر دەوڵەمەندەکانی ئەو ناوچەیە فەرزە -مادام دەوڵەتی ئیسلامیی توانای نەبێ- کە نەدارەکانی دەوروبەریان بژیەنن و، لەسەر ئەوە ئیجبار دەکرێن و، لە کاتی کەمتەرخەمییاندا سزای توندیش دەدرێن، بڕوانە: (المحلى) ج٦، ص١٠٨.

دەگیرێ بۆ ناساندنی مسوڵمانان بە یەکدی و پەیدابوون و بەهێزبوونی شارەزایی لە بارودۆخی یەکدی و پتەوبوونی پەیوەندیی برایەتیی و، سەرەنجام هاوکاریی پێکەوە کردن و، دەستبار بۆ یەکدی گرتن و جێبەجێکردنی ئەرکە مەزنەکان و، هێنانەدی ئامانجە بەرزەکان، کە پەکیان لەسەر کاری هەرەوەزیی سەرجەم مسوڵمانانی دنیا کەوتوە، بە هەموو ڕەنگ و زمان و ڕەچەڵەك و ڕەگەزەکانیانەوە، تەنانەت لەو حاڵانەشدا کە تاغووت و ڕژێمە ناشەرعییەکانیش، پەرچ و لەمپەری جۆراوجۆر دەخەنە بەردەم، وەك پێویست ئەنجام دانی ئەرك و کارەکانی حەج، دیسان لە سوود و کەڵکی زۆر هەر خاڵی نیە، بۆ چاوکرانەوەی مسوڵمانان و، بێداربوونەوە سەبارەت بە حاڵ و باڵی یەکدی، کە بێگومان ئەمەش هەنگاوی یەکەم و بەردی بناغەی برایەتیی و تەبایی و هاوکاریی و هەرەوەزکاریی نێوانیانە.



### ٥-زیکری خـــوا کردن:

ئەمەش کە چەندان دەقی قورئان و سوننەت، ئەوە دەگەیەنن، کە وێڕای بە تەنیا و بە تاکیی کردنی، بە کۆمەڵ ئەنجام دانیشی شتێکی پەسەندەو مایەی داباریینی ڕەحمەتی خواو ئارامی و ئۆخژن (سكينة) ە بەسەر دڵی بەشداربووانی کۆڕی زیکرداو، مایەی کۆبوونەوەو دەورەدانی فریشتە چاك و پاکەکانی خوایە، لەو کۆڕو کۆمەڵە، دیسان دەورێکی بەهێزو پێزێکی زۆری هەیە بۆ پێکەوە جۆشدانی دڵەکان و زیادبوونی خۆشەویستیی و ڕێزو حورمەت بۆ یەکدی و، لە ڕاستییدا ئەو خۆشەویستییە بە تینەی کە لە ئەنجامی زیکرو یادی خوادا، لەنێو مسوڵماناندا دێتەدی، بەکەم هۆکاری دیکە وا پەیدا دەبێ و، خۆشەویستیی خواو زیکری خوا کردن بۆ مسوڵمانان، وەك تەزوویەکی

کارەبایی وایە کە بە گڵۆپ و چرای دڵ و دەروونی هەموویاندا تێپەڕ دەبێ و دایاندەگیرسێنێ.

## ٦-فەرمان بە چاکەکردن ڕێ لە خراپە گرتن:

ئەمەش یەکێکە لەو خوا پەرستیی (عبادة)یانەی کە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە ڕووی توند و تۆڵکردنەوەو، بژارکردنەوەو، گەشە پێدانی کۆمەڵ و کۆمەڵگای ئیسلامییەوە، دیارە دەقی قورئان و سوننەتیش لەو بارەوە زۆرن، بەڵام ئێمە بەس دووانیان لێ بە نموونە دێنینەوە:

أ- [ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ] (التوبة -٧١).

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و، نوێژ بەرپا دەکەن و زەکاتێ دەدەن و، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەوانە بێگومان خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بە ڕاستیی خوا زاڵ و کاربەجێیە.

بەڵێ بێگومان لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوادارانی نێرو مێ، دۆست و پشتیوانی یەکدین، دەتوانن فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە بکەن و، بێگومان لە ئەنجامی ئەو خواپەرستییە مەزنەشدا کە گەورەترین و چاکترین جۆرە خواپەرستییە کە بە تاکیی و بە کۆمەڵ و لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا، ئەنجام دەدرێ، دۆستایەتیی و نزیکیی و پشتگیریی بڕواداران بۆ یەکدی زیاد دەبێت و، ڕیزەکانیان مەحکەم ترو توێژەکانیان پێکەوە پەیوەستتر دەبن.

ب- [وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ] (آل عمران -١٠٤).

واتە: ئێوە ئەی مسوڵمانینە! -کۆمەڵێك بن- یان با کۆمەڵێك تان لەنێودا هەبن[١] کە - بانگەواز بۆ چاکە دەکەن و، فەرمان بەپەسند دەکەن و ڕێ لە ناپەسند دەگرن و، هەر ئەوانەشن سەرکەوتوو و بە مراد گەیشتوو.

لەم ئایەتە بە پێزەشدا خوای پەروەردگار، سەرکەوتن و بە مراد گەیشتنی دنیاو دواڕۆژی، تایبەت کردوە بەو مسوڵمانانەوە، کە کۆمەڵێکن یان کۆمەڵێکی وای لەنێودا هەن، کە سەرگەرمی بانگەوازی خەڵك بۆ ئیسلام و لەنێو خۆشیاندا فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەن، بەڵێ کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان، وەك باغێکە کە خاوەنەکەی بەردەوام سەرگەرمی بژارکردنیەتی لە دڕك و داڵ و گژو گیاو جڕو جانەوەری زیانبەخش و، ناشتنی نەمامی چاك و پاك و بەرداری هەمەجۆرو، لە ڕاستییدا سەرفرازیی و بەختەوەریی و ساغ و سەلامەتیی کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمان بەندە بە بەردەوام بوونی پرۆسەی بژارکردن و پاککردنەوەی لە هەڵەو پەڵەو ناشەرعییەکان و، چاککردن و ڕازاندنەوەو ئاوەدانکردنەوەی بە کردارو ڕەفتارو هەڵس وکەوتە چاك و پاکە شەرعییەکان، خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: [قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ][٢] (الأعلى -١٤)،



---

(١) (چونکە وەك توێژەرانی قورئان دەڵێن: ئەگەر (مِنْ)ی سەر (منکم) بۆ (تبعیض) بێ، ئەوە مەعنای دووەم و، ئەگەر (بیانیة)ش بێت، مەعنای یەکەم دەگەیەنێ.

(٢) وشەی (تزکیة) کە هەم واتای پاککردنەوەو بژارکردن و هەم گەشەپێدان و

ئنجا هەرچەندە لێرەدا مەبەست: تاکی مسوڵمانە، بەڵام کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمانیش هەمان حوکمی هەیە.

### ٧-جەنگ و جیهاد کردن:

ئەمیش یەکی دیکەیە لەو جۆرە خواپەرستییانەی کە کاریگەرترین فاکتەرە، هەم بۆ خۆ توندو تۆڵکردنەوەو، هەم بۆ نێوخۆ بژارکردن و، خۆ پاڵاوتنیش لە خڵتەوخاڵ، چ لەسەر ئاستی تاك تاکی مسوڵمانان و، چ لەسەر ئاستی سەرجەم کۆمەڵ و کۆمەڵگاکانیشیان، دیارە جەنگ و جیهادیش مەزنترین و بەرزترین جۆرە خواپەرستییە کە مسوڵمانان بە هەرەوەزیی و دژی غەیری خۆیان ئەنجامی دەدەن[1]، ئنجا دەقی قورئانی بەپێزو سوننەتی پێغەمبەری بەرێزیش (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی جیهادو جەنگ، زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە هەر بۆ نموونە، سێ لەو دەقە بەپێزانە دێنینەوە:



١- [إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ] (الصف -٤)

واتە: بەڕاستیی خوا ئەوانەی خۆش دەوێن، کە لە پێناویدا بە ڕیز دەجەنگن، هەر دەڵێی دیوارێکی پێکەوە جۆش دراون.

---

زیادکردنیش دەگەیەنێ، کەواتە: وشەی (تزکی) یانی، خۆی پاك و چاك کرد، خراپەو هەڵەو پەڵەی لابردو، خێرو چاکەی زیاد کرد.
بڕوانە: المعجم الوسيط، ص ٣٩٦، لفظ (زکی).

(١) کەواتە: جیاوازیی نێوان (فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە)و (جەنگ و جیهاد) ئەوەیە کە یەکەمیان لەنێو مسوڵماناندا ئەنجام دەدرێ و، دووەمیان لە نێوان مسوڵمانان و، دوژمنانیاندا لە ئەهلی کوفری دژایەتییکەر.

٢- [وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾] (آل عمران ١٣٩-١٤١)

واتە: - ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر! (صلی الله علیه وسلم) بە هۆی شکستی جەنگی ئوحودەوە - بێ هێزیی مەنوێنن و، دڵ تەنگ مەبن لە حاڵێکدا کە ئەگەر بڕوادار بن، هەر ئێوە سەرکەوتوو و بەرزترن و، ئەگەر برینێکتان تێبووە، ئەوە بێگومان کۆمەڵی کافرانیش برینێکی بەهەمان شێوەیان تێبووە- کە لە جەنگی بەدردا شکستیان خوارد- و ئەو ڕۆژانەش {کە سەرکەوتن و شکستیان تێدا دەبێ} لەنێو خەڵکیدا دەستاو دەستیان پێدەکەین و، بۆ ئەوەش خوا ئەوانە بزانێ کە بڕوایان هێناوە[1] و،بۆ ئەوەی چەند شەهیدێکتان لەنێودا هەڵبژێرێ، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێ و، بۆ ئەوەی خوا بڕواداران بپاڵێوێ و لە بێژینگیان بدات و کافران نابووت بکات.



٣- [مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ] (آل عمران-١٧٩).

واتە: ناکرێ و ناگونجێ خوا، واز لە بڕواداران بێنێ. لەسەر ئەو حاڵەتە کە ئێوە لەسەرینی {کە پاك و پیس تێکەڵ و ئاوێتە بن، بەڵکو

---

(١) واتە: بە کردەوە پەرێزی خۆیان لە دنیای واقیعدا دەربکەون، ئەگەر نا خوا لە ئەزەلەوە پێیان زاناو ئاگادارە.

بە جەنگ و سەختییەكان تاقییان دەكاتەوە} هەتا پیس لە پاك جیا دەبێتەوە، خواش واناكات كە ئێوە پەنهان (غیب) بزانن {تاكو بڕوادارانی پاك و مونافیقانی ناپاك لێك هەڵاوێرن} بەڵام خوا لەنێو پێغەمبەرانیدا ئەوانەیان كە حەز بكات، هەڵیان دەبژێرێ {بۆ ئەوەی وێڕای هاوەڵانیان، لەگەڵ دوژمنانی خوادا بجەنگن، تاكو لە ئەنجامی ئەوەدا پاك و ناپاك لەیەك جیابنەوە}دەجا بڕوا بە خواو پێغەمبەرانی بێنن و، ئەگەر بڕوا بێنن و پارێزكاریی بكەن، پاداشتێكی مەزنتان هەیە.

## ٨-پـــەیوەندییە كۆمـەڵاتییەكان:

یەكی دیكە لەو جۆرە خواپەرستیی و بەندایەتییانەی كە ڕۆڵێكی زۆر گرنگ دەگێڕن، لە یەكڕیزیی و یەكدەنگیی و یەكڕەنگ و یەكسەنگیی كۆمەڵ و كۆمەڵگای مسوڵمان دا، پەیوەندییە كۆمەڵایەتییە زۆرو جۆراو جۆرەكانن، كە ئیسلام گرنگیی و بایەخێكی تایبەتی پێ داون، ئنجا ئێمە لێرەدا، مەوداو دەرفەتی ئەوەمان نیە كە مەسەلەی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان بتوێژینەوە[1]، بەڵام لێرەدا هەروا بە خێرایی ئاماژە بە دە (١٠) لەو پەیوەندییە گرنگ و سەرەكییانە دەكەین و، تەنیا ناوونیشانەكانیان باس دەكەین:

یـــەك: ژن و مێردایەتیی (الزوجیة).

دوو: بـــاب و دایك ڕۆڵایەتیی.

سـێ: خزمـــایەتیی.

---

(١) لە كتێبی: (ڕەوشت و ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكان)دا، بەدرێژیی لە بارەیانەوە دواوین و، لە: (مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاكاری ئیسلامیی)شدا بەدرێژیی لە بارەی ڕەوشت و ئاكارەكانەوە، بەگشتی دواوین.

چوار: دراوســێیەتیی.

پێنج: هـاوەڵایەتیی ( الصـداقـة).

شەش: میوانداریێتیی (الضّیافة).

حــەوت: ســەردان و هــاموشــۆ.

هەشــت: ســەرلــێدانی نەخــۆش (عیــادة المریض).

نۆ: لەگـەڵ جەنـازەدا چوونە سـەر گـۆڕسـتان و، سـەرەخۆشـیی کردن و دڵدانەوەی خاوەن مردوو.

دە: بەشــداریی کردنی شــادیی و خۆشــیی یەکدی.



خوینەرانی خۆشەویست!

١٣٣



لێرەدا کۆتــــایی بەو کورتە لێکۆڵینەوەیەمـــان دێنین، لەبارەی خواپەرستییەوە، دوای ئەوەی زانیمان:

خواپەرستی (عبادة الله):

١- چەمك و واتایەکەی چیە و چۆنە؟

٢- چ پلە و پایە و پێگەیەکی بەرزو ناوازەی هەیە لە ئیسلام دا؟

٣- شوێنەوارو بەرهەمەکانی لە ژیانی تاك و کۆمەڵدا چی و چیین؟

خـــوا بەلوتف و بەزەیی بێ سنوری، یارمەتییمان بدات، ببینە خواپەرستی ساغ و ڕاست.

# بەشی دووەم

# تــەزکیـــە

باسی یەکەم: چەمک و واتای تەزکیەی نەفس.

باسی دووەم: پێگە و بەرهەمی تەزکیەی نەفس.

باسی سێیەم: چۆنیەتی تەزکیە بوونی نەفس و، هۆکارەکانی.

باسی چوارەم: چوار کورتــە ســەرنج لە بــارەی تــەزکیەی نەفـس و، قوتابخانەکانی تەزکیە و ڕێبازەکانی تەصەووفەوە.

باسی پێنجەم: کورتە هەڵسەنگاندنێکی تەزکیە و تەصەووف.



## دەستپێك

بەرێــزان!

لە سۆنگەی ئەوەوە، کە قورئانی بەرز و بەپێز، لە پانتاییەکی بەرچاودا، باسی تەزکیەی نەفسی کردوە و، لە چوار شوێنی سەربەخۆدا، وەك یەکێك لە چوار ئەرکە گرنگ و سەرەکییەکەی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلى الله عليه وسلم) ئەژماری کردوە:

١- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴿٢﴾ ﴾الجمعة.



٢- ﴿ رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ ﴿١٢٩﴾ ﴾البقرة.

٣- ﴿ كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴿١٥١﴾ ﴾البقرة.

٤- ﴿ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴿١٦٤﴾ ﴾آل عمران.

بۆیە ئێمەش ستایش بۆ خوای بەخشەر، گرنگییەکی باشمان پێداوە و، کۆمەڵێك بەرهەممان لەو بوارەدا، هەن:

١- (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)، کە چاپی شەشەمی بەڕێوەیە.

٢- (گەڕانەوە بۆ لای خوا)، کە چاپی شەشەمی بەڕێوەیە.

٣- (یادی خوا).

٤- (گیانی ژیان).

ئەوەی لەم بەشەش دا، دەیهێنین پوختەی وەرگێڕراوی (الفصل الرابع)ە، لە (الكتاب التاسع)ی {موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله}[1]، بەڵام کەسێك بیەوێ درێژەی بابەتی تەزکیەی نەفس بخوێنێتەوە، لەو سەرچاوانەدا کە ئاماژەمان پێیاندا، دەستگیری دەبێ.

بۆ وێنە:

لە کتێبی (گیانی ژیان)دا، پازدە (١٥) هۆکاری تەزکیە بوونی نەفسمان خستوونە ڕوو[2]، هەروەها لە کتێبی (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خواچوون)دا، وردەکاریی زۆرمان لە بارەی گەلێك لایەنی تەزکیەی نەفسەوە، خستوونە ڕوو.

---

(١) ص ١٢٩- ١٩٧، ط٢ ٢٠١٩م، کە ڕاستەوخۆو بێ دەستکاریی وەری دەگێڕینە سەر زمانی کوردیی.

(٢) بڕوانە: لاپەڕە: ١٠١- ٢١٦، چ١.



## باسی یەکەم

## چەمک و واتای تەزکیەی نەفس

**یەکەم: لە ڕووی زمانەوە:**

وشەی (تَزْكِية) لە (زَكَى يَزْكُو زَكَاة وَتَزْكِية) هاتوە دەگوترێ: (زَكَى الزّرْع: نَمَا وَتَرَعْرَعَ) یانی: کشتوکاڵەکە گەشەی کردو، فراژوو بوو.

هەڵبەتە وشەی (تزكية) وێڕای گەشەکردن (نمو)، هەر کام لە مانای: پاککردن (تطهير) و چاککردن (إصلاح)یش دەگەیەنێ، بەڵام وا پێدەچێ مانای ڕیشەیی (تزكية) گەشە کردن و فراژوو بوون بێ[1].





**دووەم: لە ڕووی زاراوەییەوە:**

بە سەرنجدانی دە (١٠) ئایەتەکانی سەرەتای سوورەتی (الشمس) چەمك و واتای زاراوەیی، وشەی (تزكية) و، پاشان تەزکیەی نەفس، واتە: خۆ پاك و چاككردن و گەشە پێدان، باش ڕوون دەبێتەوە:

﴿ وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا ۝١ وَٱلْقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ۝٢ وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ۝٣ وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰهَا ۝٤ وَٱلسَّمَآءِ وَمَا بَنَىٰهَا ۝٥ وَٱلْأَرْضِ وَمَا طَحَىٰهَا ۝٦ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ۝٧ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ۝٨ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠ ﴾الشمس.

واتە: سوێند بە خۆر و بە تیشکەکەی(١). سوێند بە مانگ کە شوێنی دەکەوێ(٢). سوێند بە ڕۆژگار کە دەیدرەوشێنێتەوە (واتە:

---

(١) مختار الصحاح، ص ٢٤٨، ز، ك، ١، المعجم الوسيط، ص ٣٩٦..

ڕووی زەوی)(٣). سوێند بە شەوگار کە دایدەپۆشێ (یانی: ڕووی زەوی)(٤). سوێند بە ئاسمان و ئەو زاتەی بینای کردوە(٥). سوێند بە زەوی و ئەو زاتەی ڕایخستوە(٦). سوێند بە نەفس (ی مرۆڤ) و، بەو کەسەی ڕێکیخستوە(٧). گوناهکاریی و پارێزکارییەکەی فێرکردوە(٨). بێگومان هەر کەس (نەفسی خۆی) پاك و چاك بکات، سەرفرازە(٩). هەر کەسێکییش (نەفسی خۆی) پەنهان بکات (لە ژێر کەمڕەی گوناهاندا بیشارێتەوە) پەشێمان و ماڵوێرانە(١٠).

**ئەم ئایەتە موبارەکانە، زۆر ڕاستیی مەزنیان لێ وەردەگیرێن، بۆ نموونە:**

(١)- مرۆڤ دروستکراوێکی مەزن و ناوازەی خوایە، چونکە خوای کارزان لە ڕیزی هەشت (٨) لە دروستکراوە گەورە و گرنگەکانی خۆیدا ناوی هێناوە.



(٢)- خوای بەرز و مەزن دوای یازدە (١١) سوێندی گەورە، ڕایگەیاندوە کە مرۆڤ بە هۆی تەزکیەی نەفسیەوە، سەرفراز و، بە مراد گەیشتوو دەبێ و، بە پێچەوانەشەوە: زیانبار و پەشێمان!

(٣)- خوای زانا و شارەزا ڕایگەیاندوە کە مرۆڤی بە تێر و تەواویی دروستکردوە: (وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّىٰهَا) چونکە وشەی (تسوية) یانی: ڕێك و پێك و تەواوکردنی شتێك[1].

(٤)- خوا عزوجل توانا پێدرانی مرۆڤ بە گوناهکاریی و پارێزکاریی، یەکسەر دوای باسکردنی تێر و تەواوییەکەی باسکردوە، ئەوەش ئاماژەیە بەوە کە تواناى چاکەکاریی و خراپەکاریی، لە مرۆڤ دا، چاکترین دەرەوشێنەرەوەی تێر و تەواوییەتی.

---

(١)) مختار الصحاح، ص ٢٨٩، ٢٩٠. لفظ: س و١.



(٥)- بۆیە خوای کاربەجێ توانادار کردن (تمکین)ی مرۆڤ، لەسەر تاوانباریی و پارێزکاریی بە وشەی خورپە (إلهام) دەربڕیوە: ( فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ) چونکە وەك چۆن زانیاریی خورپەیی (العلم اللّدنيّ) خاوەنەکەی هیچ زەحمەتی پێوە ناکێشێ، توانادار بوونی مرۆڤ، لەسەر خێر و شەڕیش، شتێکی خوارسك (فطري) و زگماکە.

(٦) بۆیەش دوو وشەی (فجور) و (تَقْوى) لە جیاتی: (شرّ) و (خیر) و هاووێنەکانیان بەکارهێنراون، چونکە (تَقْوَى) بەرهەمی ئیمان و خواپەرستیی و تەزکیەیە و، (فجور)یش، زادە و بەرهەمی کوفر و لادان و سەرپێچییە.



کەواتە: پارێزکاریی لووتکەی هەرەبەرزی دینداریی و مسوڵمانەتییەو، تاوانبارییش، پلەی هەرە ژێرەوەی دابەزین و شۆڕبوونەوەی مرۆڤە.

١٤١



کەواتە: تەزکیەی نەفس، خۆپاك و چاك کردن، بریتیە لە:

گەشەپێدان و بەهێز و پێزکردنی لایەنی پارێزکاریی و چاکەکاریی، ئەویش بە هۆی بەکارهێنانی سەرجەم ئەو هۆکار و ئامرازانەی، کە ئەو لایەنە لە مرۆڤ دا فراژو و دەکەن و زیاد دەکەن، چونکە پارێزکاریی (تقوى) لە دەروونی مرۆڤ دا، لە شێوەی دەنکە تۆوێك، یان نەمامێك دایە، کە بە خزمەتکردن، گەشە و زیاد دەکات و، بە پشتگوێ خستن و مشوور لێ نەخواردن، دەپووکێتەوە.

هەڵبەتە بە ئەندازەی بەهێز و پێزبوونی، لایەنی خێر و پارێزکارییش لە دەروونیی مرۆڤ دا، لایەنی خراپە و تاوانبارییش، تەنگی پێ هەڵدەچنرێ و، جێی پێ لێژ دەبێ و، بێهێز دەبێ.

ئیدی سەرەنجام:

لە یەك كاتدا و هاوتەریب:

پارێزكاریی و چاكەكاریی لە دەروونی مرۆڤ دا، بەهێز و پێز و بە برشت دەبێ و، بە پێچەوانەشەوە: لایەنی گوناهو لادان و خراپە، بێهێز و بێ برشت دەبێ، یانی: دەروونی مرۆڤ، هەم بە چاكە جوان دەبێ و دەرازێتەوە و، هەم لە خراپەش دەربازی دەبێ و پاك دەبێتەوە.

پوختەی پێناسەی تەزكیە:

{تَزْكِيةُ النَّفْس، هِيَ إِنْمَاء بذْرَة التقْوَى المُودَعَةِ فِيهَا، ثُمَّ التَّمْكِين لَهَا فِيهَا إِلى أَنْ تنشأ وتترعرع وتُثْمِر، وَفِي الوقت نفسه: قَلْعُ جذور، الفجور فيها وتطهيرها منها}.

واتە: تەزكیەی نەفس: گەشەپێدان و، پاشان چەسپاندنی تۆوی تەقوایە لە دەرووندا، هەتا گەشە دەكات و فراژوو دەبێ و بەر دەگرێ و، لە هەمان كاتیش دا: لە بێخەوە هەڵكەندنی ڕەگ و ڕیشەی تاوانباریی و خراپەكاریی و، نەفس لێ پاككردنەوەیەتی.

كەواتە: نەفسی پاك و چاك (النفس الزكية) نەفسێكی پارێزكار و چاكەكارە و، بە پێچەوانەشەوە، نەفسی گوناهكار و خراپەكار، نەفسێكی پیس و پۆخەڵە.



## باسی دووەم

## پێگە و بەرهەمی تەزکیەی نەفس

دەتوانین گەلێك بەڵگان لەسەر گرنگیی و بەرزیی، پێگە و پلەی تەزکیەی نەفس و، بەرهەم و شوێنەواری پڕ فەڕو پێزی بهێنینەوە، بەڵام ئەم حەوت (٧)ە، بە کافی دەزانین:

**یەکەم: تەزکیە یەکێکە لە چوار ئەرکە گەورە و گرنگەکەی کە پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) پێیان ڕەوانە کراوە:**

ئەو چوار ئەرکەش بریتین لە:





١- بە سەردا خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا.

٢- تەزکیە کردن.

٣- بەرنامە (کتاب) فێرکردن.

٤- حیکمەت فێرکردن.

بۆ وێنە:

خوای کارزان و میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى بَعَثَ فِى ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴿٢﴾ ﴾الجمعة.

کە هەمان مەبەست، لە سێ شوێنی دیکەی قورئانیشدا هاتوە:

١- ﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ ﴿١٢٩﴾ ﴾البقرة.

٢- ﴿ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴿١٥١﴾ ﴾البقرة.

٣- ﴿ لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ ﴿١٦٤﴾ ﴾آل عمران.

دووەم: هەر کەس نەفسی خۆی تەزکیە بکات سەرفرازیی ڕەها (الفلاح المطلق)ی بۆ دەستەبەر دەبێ، کە بریتیە لە: چوونە بەهەشت:

ئەو ڕاستییەش لە زۆر ئایەتی قورئاندا دەدرەوشێتەوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ ﴾الأعلى.

٢- ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ ﴾الشمس.

٣- ﴿ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾ ﴾طه.

(فلاح)یش (راغب الأصفهاني) ئاوای پێناسە کردوە[1]:

{الفلاح: بقاء بلا فناء، وغنى بلا فقر، وعز بلا ذل، وعلم بلا جهل}.

واتە: سەرفرازیی: مانەوەی بێ لەنێوچوون و، بێ نیازیی بێ هەژاریی و، بالآدەستیی بێ زەبوونیی و، زانیاریی بێ نەزانین و نەفامییە.

هەڵبەتە ئەمەش تەنیا لە بەهەشت دا دەبێ، بۆیە وشەی (فلاح) بە پلەی یەکەم، لە بەهەشت و چوونە نێوی دا دێتەدی.

**سێیەم: خوا عزوجل تەزکیە بوونی کردوە بە شوێنەوار و، بەرهەمی هەرە گرنگی پەیڕەویی کردن لە ئایینەکەی و، لە پێغەمبەرانی (علیهم السلام):**

ئەم ڕاستییەش لە زۆر ئایەتەکان دا خراوەتە ڕوو، بۆ نموونە:

١- ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ ﴾عبس.

٢- ﴿ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ ﴾عبس.

**چوارەم: خوای بەخشەر وەدەستهێنانی تەزکیەی نەفسی، کردوە بە چاکە و بەخشش و بەزەیی خۆی:**

وەك فەرموویەتی:

﴿ .. وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ ﴿٢١﴾ ﴾النور.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٦٤٤.

**پێنجەم: خوای کارزان تەزکیەی نەفسی، بە دژ و پێچەوانەی شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان، داناوە:**

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا ﴿٢١﴾ ﴾النور.

شەشەم: خوای بەخشەری زانا، هەر کام لە (يحيى بن زكريا) و (عيسى بن مريم)ی (عليهما السلام) بە خاوەنی تەزکیە ناوبردوون:

١- ﴿ يَـٰيَحْيَىٰ خُذِ ٱلْكِتَـٰبَ بِقُوَّةٍ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحُكْمَ صَبِيًّا ﴿١٢﴾ وَحَنَانًا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةً ۖ وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾ ﴾مريم.

١٤٦

٢- ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَـٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ ﴾مريم.

شایانی باسیشە: یەحیا و عیسا سەلامی خوایان لێ بێ، لە قورئانێ دا، هیچ هەڵە و پەڵەیەکیان پاڵ نەدراوەتەلا!

حەوتەم: لە سۆنگەی ئەوەوە کە نەفس تەزکیە بوون، پایەیەکی بەرزی هەیە، خوا هەر کەسێك بە ناهەق لافی تەزکیە بوونی خۆی لێدا بێ، سەرزەنشتی کردوە:

١- ﴿ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ ﴾النجم.

٢- ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ ﴾النساء.

## باسی سێیەم

## چۆنیەتی تەزکیە بوونی نەفس و، هۆکارەکانی

بەڕێزان!

ئەم باسە لە دوو بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

بڕگەی یەکەم: چۆنیەتی تەزکیە بوونی نەفس.

بڕگەی دووەم: هۆکارەکانی تەزکیە بوونی نەفس.

### بڕگەی یەکەم: چۆنیەتی تەزکیە بوونی نەفس:

مەبەست لە (نفس) کە بە کوردیی (دەروون)ی بۆ بەکاردێ، لایەن و دیوی مەعنەویی نابەرهەستە لە مرۆڤ دا، ئنجا مادام خوا عزوجل باسی کردوە، کە مرۆڤی لە دوو بەش و دوو پێکهاتە دروستکراوە، جەستەیەکی خاکیی و ڕووحێکی خوایی، وەك فەرموویەتی:

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾الحجر.

کەواتە: مەبەست لە نەفس هەر ڕووحە، بەڵام پاش ئاوێتە بوونی لەگەڵ جەستەدا، هەر بۆیەش مەدح و زەم تەنیا بۆ نەفس بەکار هێنراون و ، بۆ ڕووح بەکارنەهاتوون، چونکە ڕووح بەبێ چوونە نێو جەستە، خێر و شەڕی لە دەست نایەت، تاکو بە پێی ئەوە: مەدح یان زەم بکرێ.

ئنجا شایانی باسە: کە نەفس بە گشتی لە قورئانێ دا، سێ قۆناغی لە بارەوە باسکراون:

١- قۆناغی یەکەم: (الأمّارة): {زۆر فەرمانکەر بە خراپە}.

﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ ﴿٥٣﴾ ﴾يوسف.

٢- قۆناغی دووەم: (اللّوّامة): {زۆر سەرکۆنەکەری خاوەنەکەی}.

﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴿٢﴾ ﴾القيامة.

٣- قۆناغی سێیەم: (المُطْمَئِنّة): {سەقامگیر - ئۆقرە گرتوو}.

﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ ﴾الفجر.

مەبەست لەو سێ قۆناغەش، بەمجۆرەیە:

١- مرۆڤ بەر لەوەی قۆڵ لە پاك و چاککردنی خۆی هەڵماڵێ و، دەست و پەنجە لەگەڵ خۆی دا نەرم بکات، نەفسەکەی لەسەر حاڵەتی (أَمَّارَة بالسوء)ە و، خاوەنەکەی بەرەو هەڵدێری گوناهو تاوان تاو دەدات.

٢- دوا ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ نەفسی دا دەکەوێتە تێکۆشان و، بەرهەڵستیی ئارەزووە ناشەرعییەکانی دەکات، نەفسەکەی دەکەوێتە قۆناغی (لَوَّامَة) و، ئەگەر پێشتر بە گوناهان دڵخۆش بوو و، بە بادەی یاخیبوون سەرخۆش بوو، ئەمجارە هۆشیارو بە هۆشە، هەرچەندە جارێ هەر نەساغ و نەخۆشە!

٣- پاش ئەوەی بابای تێکۆشەر لەگەڵ خۆی (مجاهد نفسه) دەگاتە قۆناغێکی لە پێشتری تەزکیە و، بە پەیژەی پارێزکاریی دا پێهەڵا دەچێ و، لە دەست هێزی کێشکەری هەوا (قوة جاذبية الهَوَى)



دەردەچێ، دەگاتە قۆناغی سەقامگیریی و ئۆقرەیی (مُطْمَئِنَّة)، یانی: چەسپاویی لەسەر جادەی شەریعەت و، سەرووی حاڵەتی لەرەلەر (تَذبذَب) لە نێوان خێر و شەردا.

کەواتە:

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، دەتوانین لە وەڵامی پرسیاری: {چۆن تەزکیەی نەفس دێتە دی؟}دا بڵێین:

پڕۆسەی تەزکیەی نەفس، دێتەدی لە میانی تێکۆشانی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا و، هەوڵدانی بۆ مل پێ کەچکردنی نەفسی، بۆ هەر داواکارییەکی شەریعەت، بە هەردووك باری:



أ- ئەرێنیی: ئەنجامدانی فەرمان پێکراوەکان (فعل المأمورات).





ب- نەرێنیی: خۆ دوورگرتن لە قەدەغە کراوەکان (إجتناب المحظورات).

تاکو دەگاتە قۆناغی سەقامگیریی (إطمئنان) و، نەفسی بە یادی خوا ئارام دەگرێ و، لەبن باری شەرع دا، خۆی ڕادەگرێ بۆ فەرمانی خوا ملکەچ و، بە قەدەری ڕازیی دەبێ، کە لە ڕاستیی دا، پابەندیی بە شەریعەتەوە، بە جێ بەجێ کردنی ئەرکەکان و، خۆپاراستن لە قەدەغەکان نێوەڕۆك و جەوهەری پارێزکاریی (تقوى) دێتەدی.

بەخشش و بەزەیی خواش، بەرانبەر بە بەندەکانی لە بواری تەزکیەی نەفس دا، لە دوو شتان دا خۆی دەنوێنێ:

١- ڕێنمایی کردنیان لە ڕێی وەحییەوە، بۆ گەیشتن بە تەزکیەی نەفس.

٢- هاوکاریی کردنی و کار ئاسانیی کردنی بۆیان، لەمیانی پرۆسەی تەزکیەی نەفس دا.

برگەی دووەم: هۆکارەکانی تەزکیە بوونی نەفس:

هۆکارەکانی تەزکیە بوونی نەفس، زۆرن، بەڵام ڕەنگە ئەم نۆ (٩)یە، سەرەکییەکانیان بن:

**هۆکاری یەکەم: کارلێککردن لەگەڵ ئایەتەکانی خوادا، بە خوێندنەوە و گوێبیستبوونیان:**

پێشتر باسمان کرد، کە خوای میهرەبان و کارزان لە چوار ئایەتی موبارەکی قورئان دا ئەرکەکانی پێغەمبەری خاتەمی (صلی الله علیه وسلم) لە چوار شتان دا کورت هەڵێناون: ١٥٠

١)- ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾.

٢)- ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ ﴾.

٣)- ﴿ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ ﴾.

٤)- ﴿ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾.

جێی سەرنجیشە کە هەر لە چوار ئایەتەکەدا: بە سەردا خوێندنەوەی ئایەتەکان: (يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ) پێش ئەرکەکانی دیکە خراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە: تەزکیە بوونی نەفس، بناغەکەی قورئان و کارلێککردنە لەگەڵ ئایەتە بەپێزەکان دا.

شایانی باسیشە: بە ڕای بەندە مەبەست لە: (وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ) وەك زۆربەی توێژەرەوانی قورئان - ئەگەر

نەڵێم هەموویان - گوتوویانە، ئەوەنیە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) (قورئان و سوننەت)یان فێر دەکات، چونکە ئەوە دووبارە بوونەوە دەگەیەنێ، پێشتریش باسی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان کراوە!

بەڵکو مەبەست لەو چوار وشەیە، بەمشێوەیە:

دوای ئەوەی ئایەتەکانی خوا لە لایەن پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بەسەر خەڵکدا، دەخوێنرێنەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا خەڵکەکە:

١- بووناسیی (معرفة)یەکی ڕاست و دروستی بۆ پەیدا دەبێ، پاشان ئیمان و عەقیدەشی بۆ دەستەبەر دەبێ.



٢- دواتریش کە تەزکیەیان دەکات: (وَيُزَكِّيهِمْ )، حاڵەتی پاکیی و چاکییشیان بۆ دەرەخسێ.

بەڵام ئەوە هەمووی لەسەر ئاستی تاکەکان (أفراد) و، دواتر ئەو تاکانە کە کۆمەڵ و کۆمەڵگا و قەوارەی سیاسیی پێك دێنن.

٣- پێویستییان بە بەرنامە (شریعة/ کتاب)یەك هەیە، بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی سیاسیی و ئیداریی و ئابووریيان: (وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ ).

٤- دواتریش پێویستییان بەکارێکی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی لێزانانە و سەر ڕاستانە هەیە، لەسەر بناغەی ئەو بەرنامەیە: (وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ).

بەڵێ هیدایەتدرانی تاکەکان لە: {بوونناسیی و ئیمان و تەزکیە}دا، بەرجەستە دەبێ و، هیدایەتدرانی کۆمەڵگاش لە: {تێگەیشتنی ڕاست و دروستی شەریعەت و، پاشان پابەندیی ڕێك و ڕاست و جێ بەجێ کردنی لێزانانە}دا، بەرجەستە دەبێ.

ڕەنگە هۆی تەفسیرکردنی (حکمة)یش بە (سنة النبي) ئەوە بووبێ، کە بەبێ گرتنی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ناگونجێ شەریعەت بە ڕێك و ڕاستیی جێ بەجێ بکرێ.

**هۆکاری دووەم: ئیمان:**

ئیمان، لە ڕووی ڕیزبەندیی بوون (الترتيب الوجودي)یەوە، نەك پلە و پایە، دووەمین هۆکاری تەزکیە بوونی نەفسە، چونکە:

نیزیکی لە خوای بێ وێنە و هاوەڵ، سەرچاوەی هەموو چاکەیەك و خێر و بەرەکەتێکەو، لەو چوار ئایەتەشدا کە پێشتر هێنامانن و، خوای زانا و شارەزا چوار ئەرکە گەورە و گرنگەکانی پێغەمبەری کۆتاییان تێدا دەخاتە ڕوو، هەمیشە (وَيُزَكِّيهِمْ)ی خستۆتە دوای (يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ). ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: خوێندنەوەی ئایەتەکان (تلاوة الآيات) هەر کام لە: بووناسیی و ئیمان، دەگرنە خۆیان، کەواتە: بەبێ هەبوونی ئیمان، مەحاڵە، نەفس پاك و چاك و گەشەدار ببێ.

**هۆکاری سێیەم: سام و هەیبەتکردن لە خوا (الخشية من الله):**

**هۆکاری چوارەم: نوێژ بەرپاکردن (إقام الصلاة):**

بەڵگەی کاریگەر بوونی ئەم دوو هۆکارەش، لە تەزکیە بوونی نەفس دا، وێڕای عەقڵ و واقیع، ئەم ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (فاطر)ە:

﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾ فاطر.

واتە: بێگومان تۆ تەنیا ئەو کەسانە وریادەکەیەوە (کە لە وریاکردنەوەکەت بەهرەمەند بن) کە بە پەنهانیی سام و هەیبەتیان بەرانبەر پەروەردگاریان هەیە و، نوێژ بەرپا دەکەن، کەسێکیش خۆی تەزکیە بکات، سوودی تەزکیە بوونەکەی، بەس بۆ خۆیەتی و، سەرەنجامیش بۆ لای خوایە.

**هۆکاری پێنجەم: یادی خوا کردن:**

دەتوانین لەو بارەوەش بەڵگەی زۆر بهێنینەوە، بۆ نموونە:



١- ﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسْمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ ﴾ الأعلى.





وەك دەبینین: پاش ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە: بابای تەزکیەکار سەرفرازە، خوای کاربەجێ دووان لە هۆکارە کاریگەرەکانی، خستوونە ڕوو، کە یادی خوا و نوێژن.

٢- ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد.

واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و بە یادی خوا دڵیان ئۆخژنی بۆ دێ و دادەمرکێ، ئاگاداربن! دڵان تەنیا بە یادی خوا دادەسکنێن.

ئنجا وەك پێشتریش - لە بڕگەی یەکەمی ئەم باسەدا - باسمان کرد:

سەقامگیریی (إِطْمِئْنَان) نەفس، دوا قۆناغی پاك و چاکبوونیەتی، کەواتە: یادی خوا (ذکر الله) هۆکارێکی گەورە و کاریگەری گەیاندنی پرۆسەی تەزکیەی نەفسە، بە قۆناغی کۆتایی خۆی.

**هۆکاری شەشەم: ماڵ و سامان بەخشین لە ڕێی خوادا:**

بەڵێ بەڕێزان!

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی گرنگ و کاریگەری، پاك و چاکبوونی نەفسە و، ئەم دوو ئایەتەش بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنن:

١- ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾التوبة.

٢- ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ ﴾التوبة.

لە ئایەتی (١٠٣)ی (التوبة)دا، خوای زانا و توانا فەرمان بە پێغەمبەری خۆی (محمد) (صلى الله عليه وسلم) دەکات، کە زەکات لە مسوڵمانانێکی کەمتەرخەم - لە ڕووی جەنگ و جیهادەوە - وەربگرێ و، بەو هۆیەوە: پاکیان بکاتەوە و تەزکیەیان بکات.

لە ئایەتەکانی (١٧ و ١٨)ی (الليل)یش دا، خوای بە بەزەیی ڕایدەگەیەنێ، کە کەسێك ماڵ و سامانی خۆی ببەخشێ و، خۆی تەزکیە بکات، لە دۆزەخ دوور دەبێ، یانی: لە سۆنگەی ماڵ و سامان بەخشینەوە، مرۆڤ تەزکیە دەبێ و، بەهۆی ئەوەشەوە، لە ئاگری دۆزەخ چەپاڵە دەدرێ و دوور دەبێ.

**هۆکاری حەوتەم: پاپەندیی بە شەریعەت و، ئەدەبە بەرزەکانیەوە، لە بواری مامەڵەی کۆمەڵایەتیی دا:**

لەو بارەوەش ئەم دوو ئایەتەی سوورەتی (النور) بە بەڵگە دێنینەوە:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدْخُلُواْ بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّىٰ تَسْتَأْنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهْلِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرْجِعُواْ فَٱرْجِعُواْ ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ ﴾النور.

واتە: ئەی بڕوادارینە! مەچنە هیچ ماڵێکەوە جیا لە ماڵەکانی خۆتان، تاکو مۆڵەت وەرنەگرن و سڵاو لە خەڵکەکەیان نەکەن، ئەوە چاکترە بۆتان، بەڵکو بیرتان بێتەوە.

بەڵام ئەگەر کەستان تێیان دا چنگ نەکەوت، مەچنە تێیان تاکو مۆڵەت دەدرێن و، ئەگەر پێشتان گوترا: بگەڕێنەوە! بگەڕێنەوە، ئەوە زیاتر مایەی تەزکیە بوونتانە و، خواش بەوەی دەیکەن زانایە.

کەواتە:

١- بەبێ سڵاوکردن و مۆڵەت وەرگرتن، نەچوونە ماڵی خەڵك.

٢-لە کاتی کەس لە ماڵ نەبوون دا، نەچوونە ژوور بەبێ مۆڵەت وەرگرتن.

٣- لە کاتی ڕێ پێ نەدران دا و، داوا لێکردنی گەڕانەوەدا، گەڕانەوە.

مایە و هۆکاری تەزکیە بوونی نەفسە.

**هۆكاری هەشتەم: خۆپاراستن لە گوناهەكان بە گەورە و گچكەوە:**

ئەمیش هۆكارێكی دیكەی كاریگەری تەزكیەبوونی نەفسە، وەك خوای پەنهانزان و میهرەبان فەرموویەتی:

﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾ النور.

واتە: بە بڕواداران بڵێ: لە نیگای چاوەكانیان بگرنەوە و، داوێنیان بپارێزن (لە گوناهو تاوان)، ئەوە زیاتر مایەی تەزكیە بوونیانەو، بە دڵنیایی خوا دەزانێ چی دەكەن!

كەواتە: چاو پاراستن لە نیگای حەڕام و، داوێن پاراستن لە زینا و تاوانە جینسییەكان، هۆكاری تەزكیە بوونی نەفسە.



**هۆكاری نۆیەم: پەنا بە خوا بردن و، داواكردنی بەزەیی و بەخششەكەی:**

بەڵێ بەڕێزان!

ئەمیش هۆكارێكی دیكەی گەورە و كاریگەری پاك و چاكبوونی مرۆڤە، وەك عەقڵ و زگماك و واقیع دەلالەتی لەسەر دەكەن و، ئەم ئایەتە بە پێزەش بەڵگەیەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ ۚ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢١﴾﴾ النور.

ئەم ئایەتە موبارەکە، زۆر بە ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنێ، کە:

١- شوێنکەوتنی هەنگاوەکانی شەیتان: مایەی گیرۆدەبوونی گوناهو تاوانە.

٢- پەیوەندیی بەندایەتیی لەگەڵ خوادا و، ئیمان پێبوونی و، ڕووتێکردنی، مایەی پارێزرانە لە شەیتان و فێڵ و پیلانەکانی.

٣- لە ئەنجامی لە خوا نیزیکیی دا و، بەهرەمەندبوون لە بەزەیی و بەخششەکەی، نەفسی مرۆڤ پاك و چاك و گەشە کردوو (مُزكّاة) دەبێ.

کۆتایی ئەم باسی سێیەمەش، بە هەردووك بڕگەکەیەوە، بەم فەرموودە و دوعایەی پێغەمبەری خوا (محمد) (صلی الله علیه وسلم) ، دێنین:



(أَللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا، وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيّها وَمَوْلاَهَا)[١].

واتە: ئەی خوایە! پارێزکاریی بە نەفسم ببەخشە و، تەزکیەی بکە، تۆ باشترین کەسی تەزکیەی بکات، هەر تۆی دۆست و سەرپەرشتیاری.

---

(١)) أَخْرَجَهُ أحمد: ٢٠١٨٠، وَمُسْلِم: ٤٨٧٧، وَالنَّسَائِيُّ: ٥٣٦٢.

## باسی چوارەم

## چوار كورتە سەرنج، لە بارەی تەزكیەی نەفس و، قوتابخانەكانی تەزكیە و، ڕێبازەكانی تەصەووفەوە

بەڕێـــزان!

ئەم باسە زۆر بە گوشراویی پێشكەش دەكەین، چونكە: لە باسی پێنجەم دا، كورتە هەڵسەنگاندن (تقیم)ێك بۆ تەزكیەی نەفس و تەصەووف دەكەین، بۆیە لێرە ئەو چوار سەرنجە گرنگەی مەبەستمانن، بە خێرایی دەخەینە ڕوو:





**سەرنجی یەكەم: تەزكیەی نەفس و، قوتابخانەكانی تەزكیە و ڕێبازەكانی تەصەووف، جیاوازن:**

ئەو لە یەك جیاكردنەوەی: (تەزكیەی نەفس) لە لایەك و، (قوتابخانەكانی تەزكیە) و (ڕێبازەكانی تەصەووف) لە لایەكی دیكەوە، زۆر گرنگە و، تێكەڵكردنیان، زیان و هەڵەی زۆر و جۆرا و جۆری لێ دەكەونەوە.

بەڵێ خۆ پاك و چاككردن (تزكیة النّفس) بابەتێكی ئیسلامیی گرنگ و گەورەیە و، كتێبی خوا زۆری گرنگیی پێداوە و، ئەم بابەتە خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم مسوڵمانانە بە گشتیی و، هیچ كەس و لایەنێك بۆی نیە، لافی بۆ خۆی قۆرخكردنی لێبدات.

بەڵام قوتابخانەكانی تەزكیەی نەفس (مدارس تزكیة النفس) و ڕێبازەكانی تەصەووف (طرق التصوّف) بە چەند ئەزموونێكی چەند

زانا و پێشەوایەك، یان چەند كۆمەڵێك لە مسوڵمانان دادەنرێن و، دەبێ هەر بەو شێوەیە تەماشا بكرێن.

**سەرنجی دووەم: تەزكیەی نەفس، بە چەمكە تایبەتییەكەی، تەنیا لایەنێكە لە لایەنەكانی ئیسلام:**

بەڵێ تەزكیەی نەفس، بەو واتایە كە مرۆڤ هەوڵبدات: بە پلەكانی پارێزكاریی و صالح بوون دا سەربكەوێ و، خۆی بكاتە خاوەن نەفسێكی پاك و چاك، واتە: بژاركراو لە خوو و خدە خراپ و بەدەكان و، ڕازاوە بە خەسڵەت و ئاكارە بەرز و پەسندەكان، تەنیا یەكێكە لە لایەن و پێكهاتەكانی ئیسلام، نەك ئیسلامی تێدا كورت هەڵبێتبێ.



شایانی باسیشە:

ئەوە كە زۆر جاران، هەندێك لە كۆمەڵ و تەوژمەكانی مسوڵمانان، بەش و لایەنێكی ئیسلامیان گرتوە و، دوایی وایانزانیوە ئەوەی گرتوویانە، كۆی ئیسلامە و، هەرچی لە دەرەوەی ئەو بازنەیە، بێگانەیە بە ئیسلام و لێی جیایە، كاریگەریی نەرێنیی زۆری بووە، لە پەرتەوازەبوونی مسوڵمانان دا و، كەوتوونە بەر چەمك و واتای فەرموودەی خوا:

﴿ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ المؤمنون.

**سەرنجی سێیەم: دامەزرێنەرانی قوتابخانەکانی تەزکیە و، ئەوانەی ڕێبازەکانی تەصەووفیان پاڵدەدرێتەلا، لە زانایان و پێشەوایانی مسوڵمانان بوون:**

ئەمیش ڕاستییەکی گرنگی مێژووییە و، هەر کام لە دامەزرێنەرانی ڕەوت و قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفس و، ئەوانەی ڕێبازەکانی سۆفییگەرییان پاڵدەدرێتەلا، وەك:

١- أبو حارث المحاسبي.

٢- الشيخ جُنَيد البغدادي.

٣- أبو حامد الغَزّالي

٤- أبو القاسم القُشَيْري

٥- مولانا جلال الدين الرومي

٦- عبدالقادر الجيلاني

٧- إبن تيمية

٨- إبن قيم الجوزية

٩- سيد أحمد السرهندي

١٠- بديع الزمان سعيد النورسي

هەروەها هاووێنەکانیان کە زۆر زۆرن، لە زانا و پێشەوایانی مسوڵمانان بوون و، هەر کەسەیان بە پێی خۆی خاوەنی پێگە و ڕێز و حورمەتێکی تایبەتە.

بۆیە هیچکەس بۆی نیە، بە هۆی هەبوونی هەڵە و پەڵە و لادان و خلیسکانی، هەندێك یان زۆربەی شوێنکەوتووانی قوتابخانە و ڕێبازەکانی پاڵدراو، بۆ لای ئەو زانا و پێشەوایانەوە، لە خودی ئەوانیش بکەوێتە گومانەوە و، هەڵە و لادان و خلیسکانی ئەوانەی خۆیان بە شوێنکەوتوویان دادەنێن، لە سەریان حیساب بکات.

**سەرنجی چوارەم: قوتابخانەکانی تەزکیەی نەفس و ڕێبازەکانی تەصەووف، تەنیا ئەزموون و، بۆچوونی زانایان و پێشەوایانن و، دەبێ بە تەرازووی شەریعەت بکێشرێن:**

بەڵێ وەك چۆن لە هەموو بوارەکانی دیکەدا، پێویستە خودی ئایینی بەرجەستە لە قورئان و سوننەتدا، لە تێگەیشتن لە ئایین (الفهم للدین) جیابکەینەوە، لەو بوارەشدا بە هەمان شێوە و، وێڕای حورمەت و ڕێزی زۆرمان بۆ سەرجەم زانا و پێشەوایانمان، بەڵام هیچ کامیان لە هەڵە پارێزراو (معصوم من الخطأ) نین و، پێویستە کەلەپوور (تراث)ی بواری تەزکیە و تەصەووفیش لە بێژنگیی شەریعەت بدەین و (دان) و (کا)ی لە یەك جیابکەینەوە، بە تایبەتیش کە بە هۆی دوو هۆکارەوە، ئەو بوارە، هەڵە و پەڵەی زۆری تێکە وتوون:

**یەکەم:** دووریی زۆرێك لە ئەهلی تەصەووف (بە تایبەت دواییینەکانیان) لە قورئان و سوننەت و، زانستەکانی شەریعەت و، پشت بەستنیان بە حیکایەت و خەون و قسە و قاڵی بێ سەنەد.

**دووەم:** زاڵبوونی سۆز و هەست و نەستی دەروونیی، بەسەر عەقڵ و هۆشدا لەو بوارەدا، ئاشکراشە ستەمێکی گەورەیە لە ئیسلام،

کە شتانێکی لەسەر حیساب بکرێن، دژ و پێچەوانەی بنەما ڕۆشنەکاننی، لە قورئان و سوننەت، هەرچەندە لە کەسانی دیار و ناسراوی وەك: (محي الدين بن عربي) کە {بە (الشيخ الأكبر) ناسراوە} و هاووێنەکانیشیەوە، بن!!

## باسی پێنجەم

## کورتە هەڵسەنگاندنێکی تەزکیە و تەصەووف

لە حەوت خاڵاندا ئەو هەڵسەنگاندنەتان بۆ دەکەم:

**١)**- تەزکیەی نەفس و قوتابخانەو ڕێبازەکانی کە کاریان کردوە، بۆ ئەوەی مسوڵمانان دەستیان گیر بێت لە تەزکیەی نەفس و پاك و چاك بوون، ئا ئەو ڕێبازانەو، ئەو کەلەپوورە، وەك سەرجەم بەرهەم و ئەزموونی بەشەر، چ لە بواری ئیمان و عەقیدەدا، چ لە بواری فیقهدا، چ لە بوارەکانی: ئوصوڵی فیقهو، تەفسیرو، فەرموودەناسیی، لە هەموو بوارەکاندا، ڕاست و چەوت و چاك و خراپی تێدایە، ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە، چونکە بەشەر هیچ کاتێك هەقیقەتی تەواوو ڕەهای لەلا نیە، بۆخۆی ڕێژەیی (نسبي) یەو، ئەو شتانەش کە لەبەشەرەوە دەردەچن، وەك خۆینی، واتە: دەگونجێ ئەندازەیەك ڕاستییان تێدابێ و، هەندێ هەڵەشیان تێ کەوتبێ، هەروەها دەگونجێ بە نسبەت کاتێکەوە: ڕاست بووبن و، بەنسبەت کات و شوێنێکی دیکەوە: هەڵەبن.

بەڵام ئەوەی کە پەیوەست دەبێ بە وەحییەوەو لە وەحییەوە سەرچاوە بگرێ، بە ئەندازەی ئەوە کە لە وەحییەوە سەرچاوەی گرتوە، لە حەقیقەتی ڕەها نزیك دەکەوێتەوە، بەڵام زانایان بنچینەیەکیان داناوە کە مامۆستا سەعیدی نوورسیی لە کتێبەکانی خۆیدا زۆرجار دەیڵێ: {خُذ ما صَفا دَعْ ما كَدر}، ئەوەی کە صاف و چاکە، وەریبگرە،

ئەوەشی کە لێڵە، وازی لێ بێنە، ئێمەش دەبێ ئاوا بەپێی ئەو بنچینەیە مامەڵە بکەین لەگەڵ کەلەپووری بواری تەزکیەی نەفسدا، هەروەك لەگەڵ کەلەپووری بواری فیقه، تەفسیر، فەرموودەناسیی و ..هتددا.

**٢**)- وەك چۆن لە بواری فیقهدا، مەزهەبە فیقهییەکان (المذاهب الفقهية)هەن و، لە بواری عەقیدەدا، قوتابخانە کەلامییەکان (المدارس الكلامية) هەن، بەهەمان شێوە، لەبواری ئەخلاق و تەزکیەی نەفسیشدا، قوتابخانەکانی تەزکیە (المدارس التزكوية)مان هەن، کە بێگومان ئەوانەش هەموویان ئەزموونی ڕووحیی و دینداریین، خاوەنەکانیان کەم و زۆر بەشوێن پێی پێغەمبەردا هەنگاویان ناوە، ئەوە نەبووە شتەکە پاڵ بدەنە لای خۆیان، قسەیان لە گیرفانی خۆیان دەرنەهێناوە، بەڵکو ئیجتیهادیان کردوە، دەگونجێ پێکابێتیان، کە بە تەئکید بە ئەندازەی نزیکییان لە وەحییەوەو، بە ئەندازەی پابەندییان بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) پێکانیان زیاتر بووە، دەشگونجێ نەیانپێکابێ، بەئەندازەی ئەوە کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی عەقڵی خۆیان، میزاجی خۆیان، هۆکارە دەرەکییەکان، هەواو نەفس و شەیتان، دیارە جگە لە پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێ، هیچ کەس لە هەڵەو کەم و کوڕیی پارێزراو نیە.

**٣**)- وەك چۆن جەستە پێویستیی بە مەشق و ڕاهێنان هەیەو، پێویستیی بە پارێزگاریی لێکردن هەیە، وەك خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف



خوای بەرز هەقی جەستە، بەیان دەکات، هەم بەبارە ئەرێنییەکەیدا: (وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ)، هەم بەبارە نەرێنییەکەیدا: (وَلَا تُسْرِفُوٓاْ) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ: {..فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا} (أخرجه البخاري: ١٩٧٥).

واتە: بێگومان جەستەت هەقی بەسەرتەوەیە.

ئنجا وەك چۆن مرۆڤ جەستەی هەیەو، پێویستیی بەوەیە هەقی بۆ جێ بە جێ بکرێ، ڕووحیشی هەیەو ئەو ڕووحەش پێویستیی بە خزمەت هەیە بە هەردووك باریدا، بە باری ئیجابییدا: خۆراکی بدرێتێ، پاك ڕابگیرێ، بەباری سەلبییشدا: پارێزگاریی لێ بکرێ و دوور بخرێتەوە، لەو شتانەی کە لێیان تووشی زیان دەبێ.


١٦٥


ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە جەستە، مرۆڤ خەمی لێ دەخواو، مشووری لێ دەخواو، خزمەتی دەکات، بەهێز دەبێ و ساغ دەبێ، ڕووحیش بە هەمان شێوە: بەئەندازەی ئەوە کە خەمی لێ دەخۆی: ڕووحەکە صاف دەبێ، ساغ دەبێ، چاك دەبێ و پاك دەبێ.

بۆ وێنە: دوو کەس وەك یەکن، یەکێکیان: کە خواردنی تەندروست بخوات و، ئاوی پاك بخواتەوەو، ئاگای لە جەستەی خۆی بێ و، بیپارێزێ لە خواردنی زیان بەخش و، وەرزشی پێ بکات و پاکی ڕابگرێ و، دووری بخاتەوە لەو شوێنانەی کە زیانی لێ دەدەن، یەکیان ئاوا لەگەڵ جەستەیدا مامەڵە بکات.

ئەوی دیکەش: کە گوێ نەدا بە پاك و خاوێنیی جەستەو وەرزش پێ کردنی و، گوێ نەدا بە خواردنەکەی داخۆ تەندروستە یان نا؟ نەیپارێزێ لەو شتانەی کە زیانی لێ دەدەن، بە دڵنیاییی وەك یەك نابن.

بەهەمان شێوە ڕووحێکیش کە خاوەنەکەی خزمەتی دەکات، لەگەڵ ڕووحێکدا کە خاوەنەکەی خزمەتی ناکات، وەك یەك نین، ئەوە گومانی تێدا نیە.

ئامانجی عیلمی تەزکیەش کە وەك گوتم: بە عیلمی تەصەووف ناوی دەرکردوە، بریتیە لە خزمەت کردنی ڕووح، خزمەت کردنی رووح بە هەموو شێوەکان، بۆ ئەوەی پاك بێ، چاك بێ و، گەشە بکات و لەخوا نزیك بێ و پابەند بێ بە شەریعەت، ملکەچ بێ بۆ شەریعەت، بەشوێن پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هەنگاو بنێ و، بێزار کراو بێ لە سیفەتە نزمەکان و، ڕازاوە بێ بە سیفەتە بەرزەکان، عیلمی تەزکیەو تەصەووف، ئامانجەکەی ئەوەیە.



٤)- وەك چۆن بۆ فێر بوونی زانستەکانی دیکە مامۆستا پێویستەو، کەس لەخۆوە فێری: پزیشکیی و زمان و فیزیاو کیمیاو، هەر زانستێکی دیکە نابێ، یان بەبێ مامۆستا زەحمەتە فێر بێ، بەهەمان شێوە لە بواری تەزکیەو بۆ خوا صوڵحاندا، ئەگەر ئینسان مامۆستاو چاو ساغێکی هەبێ، ڕێی بۆ کورت دەکاتەوە، بە پێچەوانەشەوە: ڕێیەکەی زۆر بۆ درێژ دەبێتەوە، هەروەها دەشگونجێ پێی هەڵخلیسکێ و بەم لاو لادا بکەوێ، ئەو قسەیەش کە لە کتێبی: {ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون}دا هێناومەو شیکردنەوەشم لەسەر کردوە: {مَن لم یَکن لَه شَیخ فَشَیخه الشَّیطان}، ئەو قسەیە ئاوا لەو چوار چێوەیەدا، دەبێ تەماشای بکەین و بارە ڕاستەکەی ئەوەیە: ئەگەر کەسێك مامۆستایەکی نەبێ، چاو ساغێکی نەبێ، دەستی بگرێ، ڕێی لێ تێك دەچێ، ئنجا چ شەیتانێکی ئینسیی خۆی لێ دەکات بەشێخ و بە چاو ساغ، چ شەیتانێکی جیننیی

وەسوەسەو خەیاڵی خراپی بۆ دەکات، ئەوە واقیعێکەو هەیە، ئەوە بارە ڕاستەکەیەتی، بە گشتی وایە، بۆ هەر شتێك ئینسان پێویستیی بە چاوساغێکە، بەڵام من دەمەوێ ئەوەشتان پێ بڵێم:

بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتوە: ئەگەر ئینسان مامۆستایەکی دەست نەکەوت، بەتایبەت بۆ بواری لەخوا نزیك بوونەوەو بەرەو خوا چوون، پەکی ناکەوێ، چونکە قورئان و سوننەت ئەو دوو سەرچاوە ڕوون و بێ چەندوو چوونەن، کە هەموو شتێکیان تێدایە، بۆ لەخوا نزیك بوونەوەی مرۆڤ، بۆ پاك بوون و چاك بوونی مرۆڤ، هیچ گومانی تێدا نیە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە: ئایا هەموو کەس توانای هەیە ڕاستەوخۆ لە قورئان و سوننەت تێ بگا؟ کێشەکە لێرەدا هەر ئەوەیە، ئەگەرنا مامۆستایەکەش کە دەبێتە چاو ساغ، لەدەرەوەی قورئان و سوننەت، شتێکی دیکەت بۆ ناهێنێ، هەموو ڕێگاکان بەرەو لای خوا بەستراون، تەنها ئەو ڕێگایە نەبێ کە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم)، کەواتە: هونەری مامۆستاو شێخ و ئوستاد، ئەوەیە کە دەستت بگرێ و بتخاتە سەر سەرچاوەی ڕوون و بێ چەندو چوونی قورئان و سوننەت، کە هەموو کەس ئەو توانایەی نیە.





هاوەڵان (صحابة) ئەوە دیارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مامۆستاو چاو ساغیان بووە، شوێنکەوتووان (تابعین) نەمانبیستوە ڕێبازێکی دیارییکراویان بووبێ، ئەوە حەسەنی بەصرابیە، ئیبن و سیرینە، لەدوای وان شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان (تابعوا التابعین) لەدوای ئەوانیش پێشەوایانی مەزهەبەکان، کە هەشت مەزهەبی نووسراو (مُدَوَّن)مان هەن، ئێستا شوێن کەوتوویان هەن، وەك دوایی

باسیان دەکەین، پاشان ئەوانەی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان (صلی الله علیه وسلم) کۆ کردەوە، هەروەها ئەو زانایانەی لەبواری تەفسیر، یان فەرموودەدا شارەزا بوون، نەمانبیستوە نە ڕێبازێکی دیارییکراویان هەبێ، نە شێخێکی دیارییکراویشیان هەبێ، چونکە توانیویانە یەکسەر شتەکان لە قورئان و سوننەت هەڵهێنجن، تۆ مامۆستات بۆ ئەوەیە بتباتە سەر سەرچاوەی قورئان و سوننەت، ئنجا ئەگەر بۆخۆت بتوانی دەست بگەیەنیە وێ! ئەوەی دەستی گەیشتە بەحرێ، پێویستی بە جۆگەلان نامێنێ! کەسێ پێویستی بە جۆگەلە ئاوە، دەستی نەگاتە سەرچاوە، دەستی نەگاتە ئاوی ئەو دەریایە.

٥)- بە گشتی هەندێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف[1] کارتێکراو بوون، بە سێ شتان:

یــەك: فەلسەفەی هیندیی: کە پێی دەگوترێ: (النّرفانا)، ئەم فەلسەفەیە ئامانجی ئەوەیە ئینسان بەرەو نەمان (فناء) بەرێ، لە میانی برسیی بوون و، دنیا بەکەمگرتن و، واز لە دنیا هێنان و، پشت لە ئارەزووەکان کردندا، ئینسان بەرەو ئەوە بەرێ، کە غەریزەکانی خۆی لەبیر بکات و، کپیان بکات، ئەوە لە فەلسەفەی هیندیی دایە، کە ئەوە مەرج نیە هەمووی بە گشتی ڕەفز بێت، چونکە لە ئیسلامیشدا، خۆ برسیی کردن هەیە، ڕۆژوو گرتن، دنیا بەکەمگرتن، هەیە، بەڵام کاتێك ئەوە بکرێتە ئامانج، یان زێدەڕۆیی تێدا بکرێ، ئەوە خراپە.

---

(١) هەمیشە بە ئینصاف بن بۆ ئەوەی لە دادگەرییەوە نزیك بن، لەنێو صۆفییاندا باش هەن و خراپیش هەن، لەنێو سەلەفییاندا بەهەمان شێوە، لەنێو شەرعزانانداهەرواو، لەنێو لایەنە ئیسلامییەکانیشدا، چاك هەیەو خراپیش هەیە.

دووو: هەندێ لە قوتابخانەو ڕێبازەكانی تەصەووف، كارتێكراو بوون بە گۆشەگیریی نەصرانیی (رهبانیة النصاري)، كاتێ خۆی گۆشەگیریی و ژن نەهێنان لە نێو نەصرانییەكاندا زۆر باو بووە، ئنجا لە ژیانی ڕاهیبە نەصرانییەكاندا شتی سەیر سەیر هەیە: هی وایان هەبووە گوتوویەتی: حەوت ساڵە ئاو بەجەستەم نەكەوتوە لەبەر خوا! هەیانبووە لە پیاوان و ئافرەتانیان هاوسەرگیریی نەكردوە! هەبووە گوتوویەتی: حەوت ساڵە بەس گیام خواردوە! هەبووە گوتوویەتی: من ئەوە سێ ساڵە، لەنێو بیرێك دام! خوای پەروەردگاریش ئاماژەی پێ دەكات دەفەرموێ:

﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَـٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الحديد



واتە: ڕەهبانییەتێكیان داهێنا، كە ئێمە لەسەرمان نەنووسیبوون {لەدینی خوادا ئەوە لەسەر ئینسان پێویست نیە، كە گۆشەگیر بێ و دوور بێ لە كۆمەڵگا} بۆخۆیان دایانهێنا، {بۆ ئەوەی زیاتر لەخوا نزیك ببنەوە} بەڵام باشیشیان بۆ ڕەچاو نەكرا {چونكە پێچەوانەی فیترەتە} ئێمە پاداشتی بڕوادارەكانماندایەوەو زۆریشیان لاڕێن.

ئێستاشی لەگەڵدا بێ، كاهین و ڕاهیبەكانیان تووشی هەڵەو پەڵە دەبن لە كەنیسەكاندا، لەبەر ئەوەی كپ كردنی ئەو غەریزانەی كە خوا بە ئینسانی داون، زۆر قورس و زەحمەتەو پێچەوانەی فیترەتە.

ســێ: هۆكارێكی دیكە كە كاریگەریی هەبووە لەسەر ڕێبازەكانی تەصەووف، فەلسەفەی یۆنانیی بووە، بەتایبەت بیردۆزەی ( فیض)،

وەك پێشتریش بەکورتیی ئاماژەیەکمان پێدا، ئەوانە قەناعەتیان وابووە - کە تا ڕاددەیەك قەناعەتەکەیان هەقی تێدایە- ئەگەر بێت و ئینسان زۆر خۆی ساف و ساغ بکات و ئەزیەتی جەستەی خۆی بدات، بەو واتایە کە خزمەت بە جەستەی خۆی نەکات، هەر خەریکی ڕووحی بێ، هەر خەریکی تێوەڕامان (تأمُّل) بێ، هەر خەریکی زیکرو فیکرو ویرد بێ و، خۆی دابڕێ لە خەڵکی، ئەوە ڕاستە ڕووح بەهێز دەکات، وەك چۆن کەسێکی کافر، یان مسوڵمان، مەشق بە جەستەکەی بکات، جەستەکەی بەهێز دەبێ، ڕووحیش هەروایە، کافرێك یان مسوڵمانێك خزمەتی ڕووحەکەی بکات، ڕووحەکەی هەر بەهێز دەبێ، بەڵام گرفتی ئەوانە ئەوە بووە کە بەتەماعی ئەوەی خوا (فیض)یان بۆ بڕێژێتە خوار، خۆیان دوور گرتوە لە شەریعەت، بێگومان لە ئەنجامی ساف بوونەوەو ساغ بوونەوەو لەبێژینگ درانی دەروونی مرۆڤدا، لە سیفەتە خراپەکان، ڕاستە ئینسان ئامادەیی بۆ پەیدا دەبێ، زیاتر سوود ببینێ لە ئیلهامی فریشتەکان، بەڵام ئەوە کافی نیە، چونکە بەبێ وەحیی، ئینسان ناگاتە هەوارو مەنزڵ.





ئنجا فەلسەفەی یۆنانیی، بەتایبەت بیردۆزەی (فیض) و بیردۆزەکانی ئیتتیحادو حلوول، کاریگەریی سەلبییان هەبووە، بۆ سەر هەندێ لە ڕێبازەکانی تەصەووف.

٦)- هەر کام لە تەوژمی: صۆفییگەریی و سەلەفییگەریی وەك لە کتێبەکانی دیکەشمدا ئاماژەم پێ داوە: تێپەڕاندن و کورتهێنانیان هەبووە، بەتایبەت بەرامبەر یەکدی: تەوژمی سەلەفیی، هەرچی پەیوەندیی بە تەصەووف و ئەهلی تەصەووفەوە هەیە، هەمووی ڕەت دەکاتەوەو، نموونە خراپەکانی صۆفییگەریی زیاتر زەق دەکاتەوە،

بۆ وێنە: باسی ئیبن و عەرەبی دەکات، باسی حەللاج دەکات، باسی چەند هەڵەیەکی کتێبی (إحیاء) دەکات، باسی چوار هەڵەی مەولاناو کێ و کێ دەکات! بەڵام باسی چاکەکانیان ناکات.

ئەهلی تەصەووفیش هەرچی کەلەپووری تەوژمی سەلەفییە هەمووی ڕەت دەکاتەوە، ئەویش دیسان هەندێ هەڵەو پەڵەی سەلەفییەکان کە هەن، ئەوە زەق دەکەنەوە، بۆ وێنە: قسەی سەلەفییەك دێنێ کە گوتوویەتی: ئەو گۆچانەی من لە لاشەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاکترە، لەبەر ئەوەی گۆچانەکەم، دەتوانم ئیشانی پێ بکەم، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەدنیادا نەماوە! کە بەدڵنیایی ئەوە بێ ئەدەبییە، یان ئەو قسەیەی (إبن تیمیة) زۆر زەق دەکرێتەوە کە لەبەر تیشکی فەرموودەی ڕاست (صحیح)ی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)دا گوتوویەتی: بارگەو بنە بۆ هیچ شوێنێك ناپێچرێتەوە، مەگەر بۆ سێ مزگەوتان: مزگەوتی حەرام و، مزگەوتی پێغەمبەرو (صلی الله علیه وسلم)، مزگەوتی قودس.



ئنجا ڕاستە وەك مزگەوتان، دەبێ ئینسان تەنیا بۆ ئەو سێ مزگەوتانە بەنیەتی عیبادەت بچێ، ئیبن و تەیمییەش ڕەحمەتی خوای لێبێ، هەندێ جار لە کاردانەوەی هەندێ خەڵکی صۆفییدا، تووشی تێپەڕاندن بووە بۆ زانیارییتان! هەمیشە کارو کاردانەوە، وا لە ئینسان دەکات.

ئنجا هەندێ لە سەلەفییەکان ئەوەیان زۆر زەق کردۆتەوە، بۆ نموونە: کەسێ بیەوێ بچێ هەرەمەکانی مصر ببینێ، دەڵێن: نا

ئەوە نیە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: {لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَالمَسْجِدِ الْأَقْصَى} (أخرجه أحمد برقم: ٧١٩١، والبخاري برقم: ١١٣٢، ومسلم برقم: ١٣٩٧، وأبو داود برقم ٢٠٣٣، والنسائي برقم: ٧٠٠، وابن ماجه برقم: ١٤٠٩)!!

دەڵێین: ڕاستە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەموویەتی: بە نیەتی تاعەت و عیبادەت، تەنیا سەفەر كردن، بۆ ئەو سێ مزگەوتانە، دروستە، چونكە تەنیا ئەو سێ مزگەوتە، ئیمتیازیان بەسەر مزگەوتەكانی دیكەدا، هەیە، لەو ڕووەوە كە خێرو پاداشتی نوێژ تێیاندا بەچەندان بەرانبەر خێرترو چاكترە، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیفەرمووە: نابێ بچن بۆ دیدەنیی شوێنەوارەكانی كە ئەو گەلانە جێیان هێشتوون، یان بۆ زانست، یان بۆ صیلەی ڕەحم، یان بۆ سەفەرو گەڕان و، دروست نیە سەفەر بكەن!! كەواتە: ئەو دووانە بۆچی لەیەك دەبەستن؟!

صۆفییەكان بە گشتیی - نەك هەموویان - كورت هێنانیان هەیە لە پابەند بوونیان بە قورئان و سوننەتداو، سەلەفییەكانیش بە گشتیی - نەك تاك تاكیان - كورت هێنانیان هەیە لە ئیمانێكی شهوودیی و لە گرنگیی داندا بە لایەنی ڕووحییدا، كە ئەوەش بەرهەمی تاعەت و عیبادەت و خوا بەیەككگرتن (توحید)ە، ئینسان ئەگەر بۆ خوا صوڵحا، سیفەتی بەرزو خەسڵەتی پەسندی تێدا دێنە دی.

ئنجا بەڕێزان! هەر بۆیەش بە گشتی ئەهلی تەصەووف سەركەوتووتر بوون لە مسوڵمانانی دیكە، لە بواری خوا پەرستن و خۆپاراستن لە گوناهان و، خۆڕازاندنەوە بە سیفەتی جوان و، لە هەڵس و كەوتی جوان و چاكدا.

تەماشا دەکەین: شێخێکی تەریقەت، ئەگەر زۆریش چاك نەبووبێ، توانیویەتی سەدان و هەزاران کەس لە گوناهان بگێڕێتەوە!! بەڵام کەسانی دیکە هەبوون و هەن کە لاف لێدان و بانگەشەی گەورە گەورەیان هەبووە، بەڵام نەك خەڵك، خۆیشیانیان پێ نەگەڕاوەتەوە لە گوناهان! ئنجا ئێمە دەبێ بە ئینصافەوە قسە بکەین، لە هەردوو لایاندا تێپەڕاندن و بەزایەدانیش هەبووە.

بەداخەوە مسوڵمانان زۆر جار ئەو ئایەتەیان بەسەردا چەسپیوە، کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الروم

واتە: لە هاوبەش بۆخوا دانەران مەبن، ئەوانەی ئایینەکەیانیان بەش بەش کرد، هەرکامێکیان بەوەی کە خۆی لەسەریەتی، دڵخۆشە.

ئێستا خەڵکێکی سەلەفیی ناو - مەگەر چۆن و بەدەگمەن - ئەگەرنا بەزۆریی خەریکی ئەوەن: بیسەلمێنن کە هەبوونی:

١- حیزبی ئیسلامیی حەڕامە.

٢- لە تەحییاتدا دەبێ پەنجە بجووڵێنرێ.

٣- دەبێ دەلینگی شەرواڵ و پانتۆڵ کورت بێ.

٤- ئافرەت دەبێ بەنیقاب بێ!.

وەك ئەوەی دین تەنیا ئەوەندە بێ، صۆفییەکانیش هەر خەریکی زیکرو، فیکرو، هەندێ عیبادەتی شەخسیین و، دینەکەیان بەش

بەش كردوە! لە حاڵێكدا كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ئاگای لەوەش بوو، لەوەش بوو، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ بەهەمان شێوە، بۆچی باشترین جیل بۆ ئەوەی ئێمە بیانكەینە سەرمەشق، جیلی هاوەڵانە؟ لەبەر ئەوەی دینداریيان زۆر هاوسەنگانە وەرگرتبوو، دینداریيان لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیە وسلم) وەرگرتبوو، پێغەمبەری خواش (صلی الله علیە وسلم) لە شەونوێژدا هێندە دەمایەوە، پاژنەی پێی دەقڵیشێ، بەڵام لە جەنگ و شەیبەخوونیشدا، هیچ كەس لەو ئازاتر نەبوو، عەلی كوڕی ئەبی تالیب دەڵێ: كە تەندووری جەنگ گەرم دەبوو، ئێمە خۆمان لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) دەگرت، یانی: ئەو لە هەموو كەس لە دوژمن نزیكتر بوو، لە عیبادەت و تاعەتی شەوێشدا ئاوابوو، ئنجا بۆ عیلم، بۆ زوهد، بۆ هەموو سیفەتێكی بەرز، بۆ سیاسەت، بۆ ئاكارە بەرزو پەسندەكانیش دیارە چۆن بووە! ١٧٤

بەڵام دوایی مسوڵمانان ڕێبازەكەییان بەش بەش كرد: هەندێكی زوهدەكەی وەرگرت و، هەندێكی دیكە زانستەكەی وەرگرت و، هەندێكیان جەنگ و جیهادەكەیان وەرگرت، هەندێكیان لایەنە سیاسییەكەیان وەرگرت، بەش بەشیان كرد، دینەكەیان بەش بەش كردو بوون بە تاقم تاقم! سبحان الله! خوای پەروەردگار زۆر جار ئێمەی ئاگادار كردۆتەوە، كە وەك كافرو دەغەڵ و موشریكان، نەكەین، بەڵام ئێمە لەزۆر شتدا، وەك ئەوان دەكەین، بۆ وێنە: دەربارەی مونافیقەكان دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ الصف

هەروەها دەربارەی جوولەكانیش دەفەرموێ: ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ البقرة

كەچی چەندان مەلا دەبینی لەسەر مینبەرێ قسەیان چاكە، دواییش كردەوەكانیان پێچەوانەی قسەكانیانن!

هەروەها دەربارەی نەصرانییەكان دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَٰقَهُمْ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴿١٤﴾ ﴾ المائدة

بەڵێ، زۆر لەدەردەكانی: مونافیق و كافرو موشریك و نەصرانیی و جوولەكەكان، لەنێو موسوڵمانانندا هەن، لە ئەنجامی دوورییمان لە قورئان و سوننەتدا.



**٧)- پوختەی بیروڕام دەربارەی تەزكییە[١]:**

لێرەدا بەكورتیی بیرو ڕای خۆمتان لەبارەی (تەزكیة)وە، لە حەوت كورتە سەرنجدا بۆ باس دەكەم:

**یــەك:** وەسیەتتان لێ دەكەم: هەستیار مەبن بەرامبەر بە بەرهەم و ئیجتیهادو كەلەپووری زانایان، لە هەر بوارێكەوە بەرهەمیان هێناوە، بەرامبەر بە هیچی هەستیار مەبن، كە بەڕەهایی ڕەتی بكەنەوەو،

---

(١) هەڵبەتە ڕای خۆم لە كتێبی: {صالح بوون و بەرەو خوا چوون}دا بەتەفصیل لەو بارەوە گوتوەو، لێرەدا ناتوانم هەمووی بڵێم، هەروەها لە كتێبی: {ژیانی گیان} لەوێشدا ڕای خۆم لە بارەی {تەزكیەی نەفس}ەوە خستۆتە ڕوو، دیسان لە (الكتاب العاشر)ی {موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله}شدا، باسی ئەو بابەتەمان كردوە.

بەرامبەر هیچیشی دەمارگیر مەبن، کە بە ڕەهایی قبووڵی بکەن! وەك بەرهەمی فیکری بەشەر تەماشای بکەن، چاکەکەی لێ وەربگرن و، خراپیشی کە تێدایە، ماڵی قەڵپ سەر بە خاوەنیەتی، هیچ کەسیش نەیگوتوە: هەرچی گوتوومە، هەمووی هەقە، بەس فیرعەونم بنیوە لە قورئاندا وابڵێ:

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾ غافر

واتە: فیرعەون گوتی: تەنیا ئەو ڕایەتان پێدەڵێم کە پێم پەسندەو، جگە لە سەرڕاستیی و چاکەشتان پێشان نادەم.

هیچ زانایەکی موعتەبەر نەیگوتوە: هەرچی من دەیڵێم، هەمووی وایە، مالیك ڕەحمەتی خوای لێبێ لەنزیك قەبری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) وەستا بوو، گوتی: {كُلُّ أَحَدٍ يُؤْخَذُ مِنْ قَوْلِهِ وَيُتْرَكُ، إِلَّا صَاحِبَ هَذَا الْقَبْرِ، يَعْنِي رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ} هەموو کەس قسەشی لێ وەردەگیرێ و بەسەریشی دادەدرێتەوە، جگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە.

**دوو:** گەورە پیاوانی بواری تەزکیە هەر لە (الحارث المحاسبي) یەوە کە زۆر ناودار بووەو (أبو يزيد البسطامي) و (أبو طالب المكي)یەوە، تاکو دەگاتە (غزالي) و خاوەنانی ئەو تەرِیقەتانەی کە دیارن: بەهائەددینی نەقشبەندیی، سەیید ئەحمەدی سەرهەندیی، شێخ عەبدولقادری گەیلانیی، کوردەکانی خۆمان: مەولانا خالیدی نەقشبەندیی و، شێخ عوسمانی تەوێڵەیی، کاك ئەحمەدی شێخ و، ئەوانی دیکەی کە بەرێی ئەوانەدا ڕۆیشتوون.

بێگومان ئەوانە هیچ کامیان بێ هەڵە (معصوم) نەبوون، چونکە هیچکەس نیە هەڵەش نەکاو نەشپێکێ، بەدڵنیاییشەوە: ئەو پێشەوایانەی بواری تەزکیە، هیچ کەسیان نەیویستوە بەزم و بازاڕێك بۆخۆی دابنێ و، خەڵك لەدەوری خۆی کۆ بکاتەوە! هەمووی ویستوویەتی: خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، هەمووی ویستوویەتی: خەڵك لەدەوری ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆ بکاتەوە، بەڵام ئەوە خەڵکن دوایی ئیستیعابی ئەوەیان نەکردوەو گوتوویانە: ڕێبازی قادریی، ڕێبازی نەقشبەندیی، ڕێبازی فلان و فلان، کە لە هەقیقەتیشدا هەموویان خەڵکیان بۆ ڕێبازی (محمد المصطفی صلی الله علیه وسلم) بانگ کردوە، کە ئەویش وەك ڕێباز ڕێبازی ئەو بووە، ئەگەرنا ئایین و بەرنامەکە تەنیا هی خوایەو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك جێبەجێ کردنی شەریعەتی خوا لەسەر ئەرزی واقیع، ئاوای بۆ بەرجەستە کردووین.

**ســـێ:** مەرج نیە ئینسان هەر دەستگرتوو بێ بە ڕێبازێکی تەصەووفەوە، بەیەکێك لەو قوتابخانانەوە، ئنجا بکاتە ئامانج، ئەوە مەرج نیە، چونکە ئازایەتیی و ڕۆڵ و هونەری ئەو مامۆستایانەو ئەو ڕێبازانە، هەر ئەوەیە، ئێمە بگەیەنن بە سەرچاوەی قورئان و سوننەت، سەرچاوەی شەریعەت، بەڵام هەموو کەس توانای نەبووە لە قورئان و سوننەت و شەریعەت هەڵهێنجێ، ئەگەرنا لەدوای قورئان و سوننەت، بۆ کوێ دەچی؟ لەدوای قورئان و سوننەت، چی دیکە هەیە بۆ دینداریی؟ هیچی دیکە نیە، تەماشای کتێبەکانیشیان بکەن، هەر ئاماژە دەکەن بە قورئان و سوننەت، بە وەحیی بێ هەڵەو پەڵەی خوا.

**چــوار:** مەرج نیە ئەوانەی کە ناویان وەك شێخی مورشیدو ئوستاد نەڕۆیشتوە، پشك و بەشیان نەبووبێ لە تەزکیەی نەفس و تەصەووفدا، بۆ وێنە: پیاوێکی وەك (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ (مجموع الفتاوی)یەکەی سی و پێنج (٣٥) بەرگە، دوو بەرگی کە (١٠و ١١)ن بەناوی (علم السّلوك والتصوف)ەوەن، عاریفێکی گەورە چی دەڵێ، ئەویش هەر ئەو قسانەی کردوون، زۆر بە ڕێزو حورمەتەوە باسی شێخە کامڵەکان دەکات و دەڵێ: ئەهلی تەصەووف وەك هەر چینێکی دیکە، خەڵکی زۆر چاکیان تێدایەو لادەریشیان تێدایە، بەداخەوە زۆر لە ئەهلی تەصەووف نازانن (إبن تیمیة) وایە، هەر لەخۆوە ڕەفزی دەکەن.





(إبن القیم) کتێبێکی هەیە بەناوی (مدارج السالکین) کە شەرحی (منازل السائرین)ی (الشیخ هَرَوي) دەکات، کە شێخێکی ئەهلی تەصەووفە، هەروەها (إبن تیمیة) نامیلکەیەکی شێخ (عبدالقادر)ی گەیلانیی شەرح دەکات بەناوی: (فتوح الغیب) لە یەکێ لەبەرگەکانی (مجموع الفتاوی)داو، هەر جارێ ناوی شێخ عەبدولقادری گەیلانیی دێ دەڵێ: (قُدِّسَ سِرُّهُ)، کە ئەوە زاراوەیەکە ئەهلی تەصەووف زۆر بەکاری دەهێنن، یانی: خوا ڕووحی پاك بکا!

**پێنــج:** زانایانی ڕۆچوو و چاك تێگەیشتوو، ئەو دابەشکارییەی ئێستا هەیە: ئەوە سەلەفییەو پەیوەندیی نیە بە تەصەووفەوەو، ئەوە صۆفییەو پەیوەندیی نیە بە سەلەفییەتەوە! یان ئەوە کاری سیاسی دەکاو، هەقی زانستی شەرعیی نیەو، ئەوە فیقە دەزانێ و هەقی سیاسەتی نیە! ئەو لێکدابڕانە، عادەتی موشریکەکانەو زانایانی ئێمە وانەبوون، بۆ وێنە: (إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێبێ، بۆخۆی

دەگێڕێتەوە کە: هەر مەسەلەیەکی شەرعیی کە لێی دەوەستاو تێی نەدەگەیشت، دەچووە دەشتێك سەری لەسەر عەرزێ دادەناو دەیگوت: (یا معلّم إبراهیم، علّمني) ئەی مامۆستای ئیبراهیم! فێرم بکە! هەروەها (إبن القیم) لێی دەگێڕێتەوە دەڵێ: کە نوێژی بەیانی دەکرد، هەتا چێشتەنگاو، دادەنیشت و خەریکی زیکرو فیکر دەبوو، دەڵێ: پێم دەگوت: بۆچی پشووێك نادەی؟ دەیگوت: من بەوەوە ماوم، ئەگەرنا وزەم نامێنێ!

**شــەش:** ئێوە ئەوە بزانن! هیچ پێشەوایەکمان نیە خەڵك سوودی لێ بینیبێ و، لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحیی و تەزکیەو تەقواوەو، پشکی باشی نەبووبێ، ئیدی وریا بن! وەك کاك ئەحمەدی موفتیزادە {خوا



پلەی بەرز بکاتەوە} گوتەنی: خۆتان مەکەنە هەمبانەی مەعلوومات!

١٧٩



تەنیا زانیاریی ساردو سڕ کۆ بکەنەوە، پێی ناگەنە هیچ، دەتوانی کتێبان بنووسی و قەڕەباڵغ بی، بەڵام بۆخۆت سوودێك نابینی!

**حــەوت:** کۆتا قسەشم ئەوەیە: ئینسان بۆ ئەوەی بەخۆی بزانێ: ئایا نەفسی تەزکیە بووە، یان نەبووە؟! نیشانەکانی تەزکیە بوونی، چەند شتێکە، من لەو کتێبانەدا کە ئاماژەم پێدان، باسم کردوون:

١- ئینسان لەززەت لە عیبادەت بکات و، عیبادەتی لەسەر شان سووك بێ و بەدڵخۆشییەوە بیکات.

٢- یەکێکی دیکە لە نیشانەکانی ئەوەیە، ئینسان لەگەڵ خەڵدا مامەڵەیەکی جوانی هەبێ، چاوەڕوانیی لە خەڵك نەبێ، مەدحی خەڵك، مەغرووری نەکاو، زەممی خەڵك زۆر نارەحەتی نەکات، کەسێك خۆی بناسێ، ئەگەر یەکێ زۆر بەرزی بکاتەوە، دەڵێ:

زۆر ڕۆیشتی و، ئەگەر زۆر نزمی بکاتەوە، دەڵێ: زۆر بەرەو خوار چووی! نەوام و نەواشم، بەندەیەکی خوام!

٣- لە ئەنجامی تەزکیە بوونی نەفسدا، مرۆڤ حاڵەتێکی ئارامیی و دامەزراویی و نەلەخشاویی بۆ دروست دەبێ و، هەمیشە لە هەڵبەزو دابەزو هەڵکشان و داکشاندا نابێ.

٤- بەهۆی تەزکییە بوونی نەفسەوە مرۆڤی مسوڵمان ڕاستییەکانی ئیمان و ئیسلام (حقائق الإيمان والإسلام)ی لە عەقڵ و دڵ چەسپاوو درەوشاوە دەبن و، لەگەڵ ڕەشەباو گەردەلوولی هیچ شوبهەو شەهوەتێکدا، نالەقێ، نەك بە هەر پشووەبای شوبهەو شەهوەتێك بەملاو لادا بچێ!

ئەوەش بزانن کە قوتابخانەکانی تەصەووف، بۆ پێگەیاندنی لایەنی ڕووحیی مسوڵمانان بوون، وەك چۆن قوتابخانە فیقهییەکان بۆ پێگەیاندنی مسوڵمانان بوون، لەڕووی یاسا ڕواڵەتییەکانی شەریعەتەوە، بەهەمان شێوە هەموو زانستە ئیسلامییەکانی دیکەش، هەر بۆ ئەو ئامانجی بەرزی: باش دینداریی و دنیاداریی کردنی مسوڵمانان، بەرهەم هێنراون.

# بەشی سێیەم

# تــەقـــوا

باسی یەکەم: پێناسەی پارێزکاریی (تَقْوَى) و پارێزکار (مُتَّقِي)

باسی دووەم: بوارەکانی پارێزکاریی.

باسی سێیەم: پێگەی تەقوا و گرنگیی و بایەخی.

باسی چوارەم: بەرهەم و شوێنەوارە دنیایی و دوارۆژییەکانی تەقوا.

## دەســتپێك

خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکانم!

وەك چۆن خواپەرستیی بە هەردووك چەمکی فراوان و تایبەتیی، زادە و بەرهەمی بووناسیی و ئیمانە، هەروەها تەزکیە بوونی نەفس و پاك و چاك بوونی، بەرهەمی خواپەرستییە، بە هەمان شێوەش پارێزکاریی (تَقْوَى)ش، زادە و بەرهەمی هەموو ئەوانەی پێش خۆیەتی: بووناسیی، ئیمان، خواپەرستیی، تەزکیە.

هەڵبەتە لە نێوان: ئیمان و خواپەرستیی، لەلایەك و، لە لایەکی دیکەشەوە: تەزکیە و تەقوادا، پەیوەندیی کارتێکردنی دوو سەرە (التأثير المتبادل)ش هەیە و، هەر کامێکیان - ئەو دوو جووتە - کاریگەریی بۆ سەر ئەوی دیکە هەیە:

هەتا ئیمان باشتر و مەحکەمتر بێ، خواپەرستیی چاکتر و زیاتر دەبێ، بە پێچەوانەشەوە: خواپەرستیی (عبادة) چاکتر، ئیمان دامەزراوتر دەکات و، گەشەی پێدەدات، بۆیەش زانایان گوتوویانە: (الإِيْمَان: يَزِيدُ بالطَّاعَة، وَيَنْقُصُ بالمَعْصِية).

هەروەها: هەتا نەفسیش چاکتر و پاك و پوخت و تەزکیە بووبێ، تەقوای باشتری تێدا دەچەسپێ و، لەولاشەوە، هەتا تەقوا زیاتر بێ، نەفس پاك و چاکتر دەبێ.

ئنجا ئێمە لەم بەشی سێیەمەدا، باسی پارێزکاریی (تَقْوَى) دەکەین و، تیشکی ئایەتە بەهێز و پیرۆزەکانی کتێبی پڕ بەرەکەتی خوای بەرز و مەزنی دەخەینە سەر[1].

وەك ڕوونیش دەبێتەوە:

پاش ئیمان، خوای زانا و شارەزا (بە تێگەیشتنی بەندە) ئەوەندەی مەدحی تەقوا و پارێزکارانی کردوە و، بەڵێن و موژدەی خۆشی دنیا و دوارۆژی پێداوە، ئەوەندە مەدحی هیچ سیفەتێك و هەڵگرەکانی نەکردوە.







---

(١) وەك لە (پێشەکی و ڕێخۆشکردن)ی ئەم کتێبەدا گوتمان: ئەم بەشی سێیەمە (تەقوا)مان لە {(موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) الكتاب التاسع، ص٤٤-٧٠}، وەرگرتوە.

## باسی یەكەم

## پێناسەی پارێزكاریی (تقوى) و، پارێزكار (مُتّقي)

### أ- تەقـــوا:

**یەكەم: لە ڕووی زمانەوە:**

وشەی (تقوى) لە ڕیشەدا لە: (وَقَى يَقِي وِقَايَة... اتَّقَى يَتَّقِي تقَاةً وَتَقْوَىً وَتَقِيَّةً) هاتوە[1].

واتە: پاراست، دەپارێزێ، پاراستن... خۆی پاراست، خۆی دەپارێزێ، خۆپاراستن (یان: پارێزگاریی لە خۆكردن).

**دووەم: لە ڕووی زاراوەوە:**

(راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (وَصَارَ التقْوَي فِي تعَارف الشَّرْع: حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤْثِمُ)[2].

واتە: (تقوى) لە زاراوەی شەرع دا بریتیە لە: خۆپاراستن لە هەر گوناهباركەرێك.

ئاشكراشە: مرۆڤە بەوە لە گوناهباریی دەپارێزرێ، كە تێكڕای فەرمان پێكراوەكان (مأمورات) ئەنجام بدات و، لە سەرجەم قەدەغەكراوەكان (محظورات) دووربكەوێتەوە.

---

((١)) المعجم الوسيط، ص ١٠٥٢ .

((٢)) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٥٣٠ .

کەواتە: تەقوا هەموو شەریعەت دەگرێتەوە، بە سەرجەم لایەن و بوارەکانیەوە، چونکە شەریعەت هەمووی: فەرمانکردنە بە خۆشویستراوەکانی خوا و، ڕێگرتنە لە قەدەغە و بوغزێنراوەکانی، فەرمانپێکردنی: پێویستیی یان پەسند (أمر إيجاب أو ندب) و، ڕێی لێگرتنی: قەدەغە یان پێناخۆشبوون (نهي تحريم أو كراهة).

ئنجا هەر کام لەو فەرمان و قەدەغە (أمر ونهي)یەش: چ پەیوەست بێ بە ئیمان و عەقیدەوە، چ خواپەرستیی، چ ڕەوشت و ئاکار، چ هەڵس و کەوتەکان: حوکم و سیاسەت، ئابووریی، خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و، جەنگ و ئاشتیی...هتد.

دەشتوانین لە پێناسەی تەقوادا بڵێین:

{التَّقْوَى عِبَارَةٌ عَنْ حَالَة وملكةٍ تحصل للإنسان المسلم بسبب إيمانه وعبادته لله تعالى، تجعلة يَلْتزِم بدين الله وشريعته التزاماً دقيقاً سواء فِي دائرته الشخصيَّة، أو الأسرية، أو الإجتماعية، و يجعله فِي حالة حَذرٍ دائمٍ من الحيدة والإنحراف، وكل ذلك بدافع نَيْل رضوان الله و فَضْله}[1].

واتە: تەقوا ئەو حاڵەت و خەسڵەتە چەسپاوەیە، کە بۆ مرۆڤی مسوڵمان پەیدادەبێ، بەهۆی ئیمانی و، پەرستنیەوە بۆ خوای بەرز، کە بە شێوەیەکی ورد پابەندی دەکات بە ئایین و شەریعەتی خواوە، چ لە بازنەی کەسیی، یان خێزانیی، یان کۆمەڵایەتیی دا و، وای لێدەکات کە بەردەوام لە خۆی وریابێ: لە خلیسکان و لادان، هەموو ئەوەش بە پاڵنەری وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی و بەخششی خوا.

---

(١) ئەمە پێناسەی بەندیە.

**ب- پارێــزکار (مُتَّقـي):**

پارێزکار (مُتَّقي) کەسێکە تەقوای وەدەستهێناوە و، لە خۆیدا وەك خەسڵەتێکی ڕیشەدار چەسپاندوویەتی.

عادەتی کتێبی خوای کاربەجێش وایە، پێناسەی کردەیی شتەکان و شەخسەکان دەکات، نەك بە شێوەیەکی تیۆریی و زەینیی داڕنینیی (تجریدي)، ئەمەش سێ نموونە لە ئایەتەکانی قورئان، کە چۆن پێناسەی پارێزکاران (متقین) دەکەن:

١- ئایەتی (١٧٧)ی (البقرة):

﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾ البقرة.

ئەم ئایەتە کە بە ئایەتی چاکەکاریی (آیة البرّ) ناسراوە، خوای کاربزان پێناسەی پارێزکارانی تێداکردوە، بە هەژدە (١٨) لە سیفەتە بەرز و پەسندەکانیان و، لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ئا ئەوانەن پارێزکاران:

(١ و ٢ و ٣ و ٤ و ٥): بڕوا بە خوا و، ڕۆژی دوایی و، فریشتان و، کتێبەکان و، پێغەمبەران.

(٦ و ٧ و ٨ و ٩ و ١٠ و ١١): هاوکاریی کردنی، خزمان و هەتیوان و، نەداران و، ڕێبواران و سواڵکەران و، کۆیلان (بە ماڵ و سامانێکی خۆشویستراو لەبەر کەمیی، یان لەبەر پێویستیی خودیی).

(١٢): بەرپاکردنی نوێژ.

(١٣): زەکات دان (ئەوەی پێشێ هاوکاریی جگە لە زەکات بوو).

(١٤): وەفاداریی بە پەیمان و بەڵێن.

(١٥ و ١٦ و ١٧): خۆڕاگریی لەسەر: هەژاریی و، نەخۆشیی و، لە جەنگ دا.

(١٨): ڕاستیی (کە زمانڕاستیی و ڕاستبێژیی جۆرێکیەتی).



٢- ئایەتەکانی: (١٣٣- ١٣٦)ی (آل عمران):

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ١٣٦﴾ آل عمران.

خوای پەروەردگار لەم چوار ئایەتەدا، بە حەوت خەسڵەتی ڕیشەیی و مەزن، پێناسەی پارێزكاران دەكات:

(١): ماڵ و سامان بەخشین، لە هەردووك حاڵەتی فەرحانیی و سەختیی دا.

(٢): ڕقی خۆ قووتدانەوە و كپ كردن (وێڕای هەبوونی توانای تۆڵەكردنەوە و سزادان).

(٣): لێبوردن لە خەڵكی (خراپەكار).

(٤): چاكەكاریی (لە پەیوەندیی لەگەڵ خوا و خەڵك دا).



(٥): خوا هاتنەوەیاد، لە كاتی گوناهكردن و ستەم لە خۆكردن دا.





(٦): داوای لێبوردن كردن لە خوا.

(٧): بەردەوام نەبوون لەسەر گوناهو خراپە.

٣- ئایەتەكانی: (١٥- ١٩)ی (الذاریات):

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾الذاریات.

لەم پێنج ئایەتەش دا، خوای بەرز و مەزن، بە پێنج خەسڵەتی دیكەی گەورە و گرنگ، پێناسەی بەندە پارێزكارەكانی دەكات:

(١): چاكەكاریی (بە چەمك و واتای گشتی و فراوانی).

**(٢):** کەم خەوتن بە شەوێ (بەڵکو سەرگەرمبوون بە شەونوێژ و طاعەتەوە).

**(٣):** لە کاتی سەحەردا: داوای لێبوردن کردن لە خوا (یانی: بوغرانەبوون بە شەو بێداریی).

**(٤و٥):** هاوکاریی کردنی بابای سواڵکەر و، بابای ئاتاجی داوانەکەر.

کەواتە:

لەو سێ (٣) کۆمەڵە ئایەتەدا، سی (٣٠) خەسڵەتی پارێزکاران خراونەڕوو:

(١٨ + ٧ + ٥ = ٣٠)، کە بێگومان ئەگەر بمانەوێ سەرجەم سیفەت و ئاکارە بەرز و پەسندەکانی پارێزکاران سەرژمێر بکەین، زۆری دەوێ.

## باسی دووەم

## بــوارەکانی پارێــزکاریی

بەڕێـــزان!

ئەو بوارانەی پارێزکاریی (تقوى)یان تێدا دێتەدی و، بەرجەستە دەبێ، زۆر زۆرن، بەڵام دەتوانین وەك چەند نموونەیەکی سەرەکیی، بڵێین: ئەم یازدە (١١) بوارەن:

**(١ و ٢ و ٣): بوارەکانی ئیمان و، خواپەرستیی و، ڕەوشت:**



کە هەرکام لە ئایەتی (١٧٧)ی (البقرة) و، ئایەتەکانی: (١٣٣-١٣٦)ی (آل عمران) و، ئایەتەکانی: (١٥- ١٩)ی (الذاريات) بە ڕوونیی دەلالەتیان لەسەر دەکەن، کە پێشتر هێنامانن.

**(٤): بواری سیستمی ژیان و گوزەران، یان حوکم و سیاسەت:**

کە ئایەتی (١٥٣)ی (الأنعام) بە ڕوونیی دەیگەیەنێ:

﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾الأنعام.

واتە: هەروەها ئەوە ڕاستەشەقامی منە شوێنی بکەون و، شوێنی ڕێچکان مەکەون، ئەگەرنا لە ڕاستە ڕێی وی پەرتەوازە دەبن، ئەوە ئامۆژگاریی ویە بۆتان، بەڵکو پارێز بکەن.

### (٥): بواری کۆمەڵایەتیی:

هەروەها تەقوا پەیوەندییەکی توند و تۆڵیشی، بەم بوارەشەوە هەیە، بۆ نموونە:

خوای دادگەر لە ئایەتی (١٣)ی (الحجرات)دا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣ ﴾ الحجرات.

وەك دەبینین:

خوای کاربەجێ پارێزکاریی، کردوە بە تەرازوو و پێوەری ڕێز و حورمەتی مرۆڤەکان لە لای خوا، نەك ڕەنگ و ڕەگەز و سامان و ... هتد.

هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتەش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی فەتحی شاری مەککەدا، فەرمانی بە (بلال الحبشي) کرد بانگی دا و، هەندێك لە زلەزلاتی قوڕەیش ڕەخنەیان گرت: ئایا موحەممەد، کەسی دیکەی چنگ نەکەوت، ئەو کارەی پێ بسپێرێ؟[1].

### (٦): بــواری ئـــابووریی:

لەو بارەشەوە ئایەتی قوڕئانی بەرز و مەزن، زۆرن، کە پارێزکاریی پەیوەندیی پتەوی بەو بوارەشەوە هەیە، بۆ نموونە:

---

(١)) بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ص٢٨٥، أخرجه البيهقي في (دلائل النبوة) (٧٩/٥) بسند صحيح إلى عبدالرزاق، و قال المؤلفان: قلنا هذا مرسل صحيح الإسناد.

أ- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ البقرة.

کەواتە: بە هۆی تەقواوە مرۆڤی مسوڵمان توخنی سوودخۆریی ناکەوێ.

ب- ﴿ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُواْ كَاتِبًا فَرِهَـٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ ۖ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَـٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ ﴿٢٨٣﴾ ﴾ البقرة.

کەواتە: تەقوا دەبێتە هۆی پاراستنی ئەمانەت و زایە نەکردنی، لە بواری ڕەهن دا، کە مامەڵەیەکی دارایی و ئابوورییە.

**(٧): بــواری هاوسەرێتیی و کاروباری خێزانیی:**



لەو بارەوەش ئایەتەکانی قورئان زۆرن، کە پارێزکاریی بە و بوارەشەوە پەیوەستە و، هەتا تەقوای مرۆڤەکان ڕێژەکەی پتر بێ، پەیوەندیی و هەڵس و کەوتەکانیان باشتر دەبن، بۆ نموونە:

١- ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ البقرة.

٢- ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ۖ وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴿٢٢٣﴾ ﴾ البقرة.

٣- ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾ ﴾ البقرة.

٤- ﴿ وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ ﴾ البقرة.



**(٨): بواری هەڵس و کەوتە جــۆرا و جۆرەکانــی نێوان خەڵك:**

١- وەصیەت کردن بۆ باب و دایك و خزمان: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾ البقرة.

٢- شایەدییدان بە شێوەیەکی دادگەرانە، لەسەر دۆست و دوژمن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ المائدة.

٣- تۆڵەی کوشتن (القصاص): ﴿ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ البقرة.

٤- صوڵح و ئاشتەوایی كردن: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾ الحجرات.

٥- چپە پێكەوە كردن (النَّجْوى): ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَنَـٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَـٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَـٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾﴾ المجادلة.

**(٩): بــواری دروشمەكانی پەرستن:**

هەروەها پارێزكاریی پەیوەندییەكی توند و تۆڵی بە بواری پەرستشەكان و، نیشانە و دروشمە زەقەكانیەوە هەیە، وەك خوای پەنهانزان فەرموویەتی:

﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾﴾ الحج.

**(١٠): بــواری جەنگ و جیهاد:**

تەنانەت بواری فیداكاریی لە پێناوی خوادا و، خۆ بەكوشتدان و كوشتنی دوژمنانیش، بە تەقوا وە پەیوەستە و، لەو بارەوەش ئایەتی قورئان زۆرن، بۆ وێنە:

١- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾ التوبة.

٢- ﴿ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَـٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾ البقرة.

**(١١): بواری تێگەشتنی قورئان و، دەرككردنی نهێنییەكانی بوون و، ئاشنابوون بە یاساكانی خوا لە ژیانی بەشەردا:**

ئەمەش چەند نموونەیەكی ئایەتەكانی قورئان، لەو بارەوە:

١- دەرككردن و لێتێگەیشتنی نهێنییەكانی قورئان: ﴿ الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ﴾البقرة.

٢- پەیبردن بە یاسا گەردوونییەكان: ﴿ إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ٦ ﴾یونس.

٣- ئاشنابوون بە یاساكانی خوا، لە ژیانی بەشەردا: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ١٣٧ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ١٣٨ ﴾آل عمران.



بەڕێزان!

دەتوانین بڵێین:

هیچ بوارێك نیە لە بوارەكانی دینداریی دا، مەگەر تەقوا پێیەوە پەیوەستە و، بە ئەندازەی هەبوونی پارێزكاریی (تقوی) مرۆڤەكان لە سەرجەم بوارەكانی ژیاندا، سەر ڕاستتر و بەرچاو ڕوونتر دەبن و، پارێزراوتریش دەبن لە هەڵە و پەڵە و لادان و خلیسكان.

## باسی سێیەم

## پێگەی تەقوا و گرنگیی و بایەخی

پارێزكاریی، پایە و پێگەیەكی یەكجار بەرزی هەیە لە ئیسلام دا و، خوای كارزان و میهرەبان بایەخ و گرنگییەكی زۆری پێداوە و، بە زۆر شێواز مسوڵمانان بۆ هانداوە، بگرە مرۆڤایەتییشی بە گشتی بۆ هانداوە.

لەم شەش بڕگەیەدا، تیشكێك دەخەینە سەر پێگە و پایەی تەقوا، لە ئیسلام دا:

**یەكەم: خوای كاربەجێ و زانا، بە زۆر شێواز فەرمانی بە بڕواداران كردوە، پارێزكاربن:**

١- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾آل عمران.

٢- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾التوبة.

٣- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ ﴾الحشر.

٤- ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾المائدة.

٥- ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾المائدة.

٦- ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾ ﴾التغابن.

٧- ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٢ ﴾المائدة.

٨- ﴿ وَأَطَعْنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٧ ﴾المائدة.

٩- ﴿ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۝١٣١ ﴾النساء.

١٠- ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝٢٠٠ ﴾آل عمران.

**دووەم: خوا سبحانە وتعالى هەرچی خێر و چاکەی دنیا و دوارۆژە، بە تەقواوەی پەیوەست کردوە و، پارێزکارانی کردوون، بە خاوەن بەرەکەتی دنیا و سەرفرازیی دوارۆژ:**

وەك لە باسی چوارەم (بەرهەم و شوێنەوارە دنیایی و دوارۆژییەکانی تەقوا)دا، لە چل و یەك (٤١) خاڵ دا دەیانهێنین، بۆیە لێرە لێیان دەگەڕێین بۆ ئەوێ.

**سێیەم: خوا تبارك وتعالى تەقوای بە هۆکاری دۆستایەتیی خۆی بۆ بەندەکانی و، بناغەی دۆستایەتیی ئەوان بۆی، داناوە:**

وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی:

١- ﴿ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ ۝٣٤ ﴾الأنفال.

واتە: دۆستانی خوا تەنیا پارێزکارانن.

٢- ﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۝٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ۝٦٣ ﴾يونس.

واتە: ئاگاداربن! دۆستانی خوا نەترسیان لەسەرە نە پەژارە دادەگرن، ئەوانەی بڕوایان هێنابوو و، پارێزیان دەکرد.

**چوارەم: مرۆڤ بە بارتەقای تەقوا، لە لای خوا ڕێز و حورمەتی دەبێ و، کێ بە تەقواترە، لەلای خوا بەڕێزترە:**

وەك خوای بەرز و مەزن فەرموویەتی:

﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ الحجرات.

**پێنجەم: تەقوا ئەو ئامانج و حیکمەتەیە، کە خوای بەخشەر: کتێبەکانی خۆی دابەزاندوون و، ئایەتەکانی ڕۆشنکردوونەوە، تاکو خەڵك بۆیان مەیسەر بێ و وەدەستی بخەن:**

199

وەك خوای بێ هاوەڵ و هاوتا، فەرموویەتی:

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ١٨٧﴾ البقرة.

**شەشەم: تەقوا کۆکەرەوەی سەرجەم سیفەتە باشەکانە (جامع خصال الخير كُلِّها) هەر لە ئیمانەوە بگرە، هەتا هەر خەسڵەتێکی دیکەی بەرز و پەسند:**

کە ئایەتی (١٧٧)ی (البقرة) بە باشترین شێوە، ئەو ڕاستییە دەگەیەنێ و، ئەمەش دەقەکەیەتی و، پێشتریش هەر هێنامان:

﴿ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلۡمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُوفُونَ بِعَهۡدِهِمۡ

إِذَا عَـٰهَدُواْ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ البقرة.

له کۆتایی ئەم باسەش دا, دوو ڕاستیی گرنگ دەخەینە ڕوو:

یەك: سێ شت هەن، چۆنیەتی پەیوەندیی مرۆڤ لەگەڵ خوادا، دیاریی دەکەین:

١- ئیمان

٢- خواپەرستیی

٣- تەقوا

أ- چونکە دوای ئەوەی مرۆڤ - بە هۆی بووناسییەکی ڕاست و دروستەوە - خوا عزوجل دەناسێ و پێی ئاشنا دەبێ، بڕوای پێ دێنێ.

ب- ئنجا کە بڕوای پێهێنا و بوو بە خاوەن بڕوا (مؤمن) یەکسەر ئیمانەکەی پاڵی پێوەدەنێ بیپەرستێ و، بەندایەتیی (عبودیة) بۆ لە خۆیدا بەرجەستە بکات، چونکە پەرستن (عبادة):

١- ئەوپەڕی خۆشویستن (أقصى الحب).

٢- ئەوپەڕی بە مەزنگرتن (أقصى التعظيم).

٣- ئەوپەڕی مل بۆ کەچکردن (أقصى الخضوع).

٤- ئەوپەڕی شەرم و سام و هەیبەت لێکردن (أقصى الحياء والخشية).

٥- ئەوپەڕی پشت پێبەستن (أقصى التوكل)،

دەگرێتە خۆی.

ج- دواییش خواپەرستیی (عبادة)، پارێزکاریی (تقوی) بەرهەم دێنێ و، پارێزکاریی دوایین پلە و جۆری پەیوەندیی مرۆڤە بە خوای بەرز و بێ وێنەوە، چونکە: دوای ئەوپەڕی خۆشویستن و بە مەزنگرتن و مل بۆ کەچکردن و، شەرم و سام و هەیبەت لێکردن و، پشت پێبەستن، هیچ نامێنێ جگە لە وریایی و لێخەفتان و ئاگا لەخۆبوون لە خزمەت خوادا، ئا ئەوەش تەقوایە.

بەڵێ مرۆڤ هەتا بڕوادار نەبێ بە خوا، ناپەرستێ و، ئەهلی پەرستن نابێ و، هەتا ئەهلی پەرستنیش نەبێ، پارێزکار نابێ.



**دوو:** وەك چۆن هەر كام لە ئیمان و خواپەرستیی، چەندان پلە (درجات) ن، بە هەمان شێوە پارێزکاریی (تقوی)ش چەندان پلە (درجات)یە و، وەك چۆن لە نێوان بڕوادارێك و بڕوادارێکی دیکە و، خواپەرستێك و خواپەرستێکی دیکەدا، جیاوازیی زۆر هەیە، بە هەمان شێوەش: لە نێوان پارێزکاران (مُتَّقِین)دا، پلە پلەیی و، بەرزیی و نزمیی (تفاضل) زۆر هەیە.





ڕەنگە ئەم ئایەتەش، تاکە ئایەتێکی قورئان بێ، کە ئاماژە بەو ڕاستییە دەکات:

﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾ المائدة.

ئەم ئایەتەش لە بارەی ئەوانەوە هاتە خوار، کە بەر لە قەدەغەکراوەکانی: مەی (شراب)یان خواردبۆوە و، بۆی ڕوونکردنەوە،

کە بە هۆیەوە سزابار نەبوون، مادام دواتر پارێزکار بووبن و خۆیان لێ پاراستبێ[1].

دوایی سێ جاران، وشەی (اتقوا) دووبارە بۆتەوە: جاری یەکەم: ئیمان و کردەوەی باشی، بە دوادا باسکردوە و، جاری دووەم: ئیمان و، جاری سێیەم: چاکەکاریی (إحسان)، دوایی خوای کارزان و میهرەبان ڕایگەیاندوە: کە چاکەکارانی خۆشدەوێن (والله يُحِبُّ المُحْسِنِين) ئەوەش بەڕوونیی پلەپلەیی پارێزکاریی و پارێزکاران دەگەیەنێ.



---

(١)) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: ١٤٦٤، وَمُسْلِم: ١٥٧٢، (لُباب النقول في أسباب النزول)، السيوطي: ٤٣٧، ٤٣٨.

## باسی چوارەم

## بەرهەم و شوێنەوارە دنیایی و دوارِۆژەکاییەکانی تەقوا

بەرِێــزان!

پارێزکاریی بەرهەم و شوێنەواری پرِ بەرەکەتی زۆر و جۆرا و جۆری هەن، لە دنیا و دوارِۆژدا و، خوا پشتیوان بێ، لەم باسەدا هەوڵدەدەین، ئاماژە بە زۆربەیان بکەین و، ئەو ئایەتانەش کە هەر کام لەو بەرهەم و میوە و شوێنەوارەیان لێوەردەگرین، دەنووسین، کۆی ئەو بەرهەم و شوێنەوارانەش کە هێناومانن، چل و یەك (٤١)ن، بەم شێوەیەی خوارێ:

٢٠٣

١- پارێزکاریی، هۆکاری بەهرەمەندبوونە لە قورئان: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢﴾ البقرة.

٢- پارێزکاریی، هۆکاری لەگەڵ بەندەدا بوونی تایبەتی خوایە: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ۝١٩٤﴾ البقرة.

٣- پارێزکاریی، باشترین توێشووی رِێی بەرەو خواچوونە: ﴿وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۝١٩٧﴾ البقرة.

٤- بە هۆی تەقواوە، خوا بەندەی خۆی خۆشدەوێ: ﴿وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ۝٧٦﴾ آل عمران.

٥- تەقوا، قەڵغانێکە برِواداران لە پیلانی دوژمنانیان دەپارێزێ: ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن

تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ
مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ ﴾آل عمران.

٦- بە هۆی تەقواوە، بڕواداران لە یاسا گەردوونییەکانی خوا لە ژیانی بەشەردا، پەند وەردەگرن و، لە نهێنییەکانی مێژوو تێدەگەن: ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ ﴾آل عمران.

٧- تەقوا، تاکە هۆکاری وەرگیرانی کردەوانە، لەلای خوا: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾المائدة.

٨- بە هۆی تەقواوە، بڕواداران لە دۆستایەتیی کردنی کافران، دوور دەبن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾المائدة.

٩و١٠- تەنیا عاقڵمەندان تەقواداری ڕاستەقینە دەبن و، سەرەنجامی تەقواش، سەرفرازیی ڕۆژی دوایییە: ﴿ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِۚ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾المائدة.

١١- تەقوا، خاوەنەکەی دەکاتە پەیڕەوی ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ڕاستە شەقامی خوا: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ الأنعام.

١٢- وەك چۆن پۆشاك جەستەی مرۆڤ دەپۆشێ و، لە خراپەی دەپارێزێ، تەقواش بەو جۆرە پۆشەر و پارێزەری خاوەنەکەیەتی: ﴿يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾﴾ الأعراف.



٢٠٥



١٣- بە هۆی پارێزکارییەوە، خوا دەروازەکانی پیت و پێزە ماددیی و، مەعنەوییەکان لە خەڵك دەکاتەوە: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾ الأعراف.

١٤- بە هۆی تەقواوە، مرۆڤ: زوو خوای دێتەوە یاد و، پیلانی شەیتان دەبینێ و، کەم وایە شەیتان زەفەری پێ بەرێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾﴾ الأعراف.

١٥- پارێزکاریی، سەرەنجامی خێر بۆ پارێزکاران مسۆگەر دەکات: ﴿... إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾﴾ هود، ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾﴾ طه.

١٦- مرۆڤ بە هۆی پارێزكارییەوە، دەبێتە دۆست و نیزیكی خوا: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٢ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٦٣﴾يونس.

١٧- بە هۆی تەقواوە، مرۆڤ دروشمەكانی ئایینی خوا، بە مەزن دەگرێ: ﴿ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ٣٢﴾الحج.

١٨- تەقوا ئامانج و حیكمەتی طاعەتە و، تاكە شتێكە خوا گرنگیی پێ بدات: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٣٧﴾الحج.



١٩- تەنیا پارێزكاران، لە ئایەتە ڕۆشنەكانی خوا، پەند وەردەگرن: ﴿وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ وَمَثَلٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ٣٤﴾النور.

(٢٠و٢١و٢٢)- تەقوا، هۆكاری دابەزینی هێمنیی (سكينة)یە، بۆ سەر دڵ و، ڕێگری زاڵبوونی دەمارگیریی نەفامییە، بەسەر دڵ دا و، خوای زانا و كارزانیش تەنیا بۆ كەسانی شایستەی مەیسەر دەكات:

﴿إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٢٦﴾الفتح.

(٢٣و٢٤)- تەقوا، خاوەنەکەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) بە ئەدەب و ڕێز دەکات و، پارێزکارییش، تەنیا لە دڵ و دەروونێکی پاڵفتەکراودا سەقامگیر دەبێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَٰتَهُمْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ۚ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾ الحجرات.

٢٥- پارێزکاریی، هۆکاری ڕێزداریی بەندەیە لە لای خوا و، کێ پارێزکارتر بێ، لەلای خوا بەڕێزتر دەبێ، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەنگ و ڕەگەز و ڕەچەڵەك و ... هتد: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾الحجرات.







٢٦- بە هۆی تەقواوە، بەزەیی خوا دادەبارێتە سەر مرۆڤ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ ﴾الحجرات.

٢٧- تەقوا، مرۆڤ دەکاتە شایستەی مشوور لێخواردنی خوا و بە دۆستگرتنی: ﴿ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ ﴾الجاثية.

(٢٨و٢٩)- تەقوا، هۆکاری پەیدابوونی بەرچاو ڕوونیی (فرقان) بڕواداران، سڕانەوەی خراپەکانیان و لێبوردرانی گوناهەکانیانە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ ﴾الأنفال.

(٣٠و٣١)- تەقوا، هۆکاری دەرو لێکرانەوە و، بژیو پێدرانە بەبێ چاوەڕێ کردن:

﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾ الطلاق.

٣٢- پارێزکاریی، هۆکاری ئاسانبوونی کاری قورس و زەحمەتە:
﴿ وَٱلَّٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾ ﴾ الطلاق.

٣٣- بە پارێزکاریی، پاداشتی مرۆڤ لە لای خوا، مەزن دەبێ:
﴿ ... وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴿٥﴾ ﴾ الطلاق.

٣٤- تەقواداران، ڕاستییەکانی قورئانییان بیردەکەوێتەوە، لە کاتی خوێندنی، یان گوێبیست بوونی دا: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ الحاقة.

٣٥- بە هۆی تەقواوە، پابەندیی بە شەریعەتی خواوە، ئاسان دەبێ:
﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ ﴾ الليل.

٣٦- پێچەوانە و دژی تەقوا: بریتیە لە بێنیازیی لە خوا: ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾ الليل. ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الحشر.

٣٧- پارێزکاریی، هۆکاری سەرفرازیی ڕۆژی دواییە: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾النور.

٣٨- پارێزکاریی، بناغەی تەبایی و نێوان چاکبوون و برایەتییە، بۆ بڕواداران: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَنفَالِۖ قُلِ ٱلۡأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَصۡلِحُواْ ذَاتَ بَيۡنِكُمۡۖ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١﴾ ﴾الأنفال.

٣٩- خوا فەرمانی بە بڕواداران کردوە: کە لەگەڵ غەیری خۆشیان دا، هاوکاریی بکەن بۆ هێنانەدی چاکەکاریی و پارێزکاریی (البرّ والتقوى):

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾المائدة.

کەواتە: پارێزکاریی (تقوی) وێڕای ئەوەی خەسڵەتێکی کەسیی و تایبەتە، خەسڵەتێکی کۆمەڵایەتیی و گشتییشە.

٤٠- پارێزکاریی، بناغەی سەر ڕاستیی و ئامانج پێکان لە قسان دا و، ڕێك و پێك بوونی کاروباری تاك و کۆ (فرد ومجموع)ی مسوڵمانانە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾الأحزاب.

٤١- تەنیا بە پارێزکاریی، بەهەشتی خوا (کە شوێنی ڕەزامەندییەتی) بۆ مرۆڤ مەیسەر و دەستەبەر دەبێ:

١- ﴿ قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿١٥﴾ ﴾آل عمران.

٢- ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾الأعراف.

٣- ﴿ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ

يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ
وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾ يوسف.

٤- ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ
﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾
لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾ الحجر.

٥- ﴿ هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴿٤٩﴾ ﴾ ص.

٦- ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ
وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ النمل.

٧- ﴿ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ ﴾ مريم.

٨- ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا
وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا
خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الزمر.

٩- ﴿ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ أُكُلُهَا
دَآئِمٞ وَظِلُّهَاۚ تِلۡكَ عُقۡبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْۖ وَّعُقۡبَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ
﴿٣٥﴾ ﴾ الرعد.

١٠- ﴿ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن
لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ

وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟
مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ محمد.

١١- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ
مُّقْتَدِرٍۭ ﴿٥٥﴾ القمر.

١٢- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ
كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ
هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ الذاريات.

١٣- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ
وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ الطور.

١٤- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾
كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿٤٤﴾ المرسلات.

١٥- ﴿ وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ
وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ آل عمران.

١٦- ﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ
﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾
لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ
ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ الزمر.

لەوەش کە ڕابرد، بۆمان دەردەکەوێ کە:

بە ڕاستیی پارێزکاریی (تَقْوَى) سەرچاوەی سەرجەم خەسڵەت و، ئاکارە بەرز و پەسندەکانە لە تاك و کۆمەڵ داو، هۆکار و بناغەی تێکڕای بەرەکەت و خێر و چاکەکانی دنیا و دواڕۆژیشە، بۆ تاك و خێزان و کۆمەڵگا و دەوڵەت و، بە هۆی ڕازانەوەوە بە پارێزکاریی، سەرفرازیی دواڕۆژ و بەختەوەریی دنیا، بۆ هەموو لایەك دەستەبەر دەبن.

لێرەش دا کۆتایی بەباسی پارێزکاریی (تقوى) دێنین، کە وەك گوتمان، زادەو بەرهەمی هەرکام لە: خواپەرستیی (عبادة الله) و، خۆپاك وچاککردن (تزكية النَّفس)ەو، لەخوای بەخشەری میهرەبان داواکارین یارمەتیمان بدات هەرچی زیاتر ببینە خاوەنی: خواپەرستیی و تەزکیە و تەقوا.

## نێوەڕۆک

# خواپەرستی ـ تەزکیە ـ تەقوا

ئـەم کتێبەمـان بـۆ ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـا و گرنگیـی و بەرهـەم و شـوێنەوارەکانی هـەرکام لـە: خواپەرسـتیی (عبـادة)و، خـۆ پـاكو چاککـردن (تزکیة النفس)و، پارێزکاریی (تقوی) تەرخانکردوە.

بێگومانیـش وەك چـۆن بووناسـیی ڕێـكو ڕاسـت، ئیـمان پەلکێـش دەکات، خواپەرسـتییش زادەو بەرهەمـی ئیمانـەو، پـاكو چاکبـوون (تزکیة)یـش، بەرهەمـی خواپەرسـتییە و، لەئەنجامـی خواپەرسـتیی و تەزکیەشدا، پارێزکاریی (تقوی) پەیدا دەبێ.

بەدڵنیاییش:

بووناسـیی‌و ئیـمان‌و خواپەرسـتیی‌و تەزکیـەو تەقـواش، هەرپێنجیـان بناغە و پێکهێنەرە بنەڕەتییەکانی کەسایەتیی مرۆڤی مسوڵمانن.

www.alibapir.net

/alibapir1

/alibapir




**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

/TafseerOffice

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com